ناوی کتێب: پێخەفێک لە خوێن - کۆ چیرۆک

نووسینی: یوسف عیزەدین

بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٧٣٥

پیت لێدان: ڕۆشنا ڕەشاد

هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + تریسکە ئەحمەد

دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم

بەرگ: مریەم موتەقیان

چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٩٣٨ی
ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# ئەودیو دەرگا کۆنینەکە

بەرامبەر دەرگا کۆنینەکە ڕاوەستام و قەدەرێک تێم ڕوانی، هەموو شتێک وەک خۆی بوو.. تەنها کەللەسەری کەڵەکێوییەک زیادی کردبوو، کە نەمدەزانی کێ ڕاوی کردووە و بۆ لەوێدا هەڵواسراوە.

بێهوودە تێم دەڕوانی و دەمویست لە چاوەکانیدا سەرە داوی بەسەرهاتێک ببینمەوە.. دەمڕوانییە هەموو ئەو پیادەڕەوانەی کە بەوێدا تێپەڕ دەبوون.. بەڵام سەیر لەوەدا بوو، کەس تێی نەدەڕوانیم، هەروەک ئەوەی کە نەبم...

پیرێژنێکی بەساڵاچووم ڕاگرت و پێم گوت:

(- ئێرە ماڵی کێیە؟

- ماڵی پیرەمێرد و پیرێژنێک بوو، بەبێ کەسی سەریان نایەوە و ئێستاش ماڵەکەیان چۆڵە.

- ئەی کوڕەکەیان چی لێ هات؟

- کوڕی چی؟ من بیست ساڵ دراوسێیان بووم، منداڵیان نەبووە!

– ئەی من ناناسیتەوە؟

– من کەس ناناسمەوە...).

گومانم لە قسەی پیرێژنەکە هەبوو، گومانیشم لەوە هەبوو کە ئەو ماڵە چۆڵ بێت. بەڵام چەندم لە خۆم کرد، زاتم نەکرد لە دەرگاکە بدەم یان وەک جاران لەسەر دیوارەکەوە خۆم هەڵدەمە ئەو دیوەوە و بچمە ژوورەوە.. بەبێ ئەوەی ئاگادار بم لە بەیانییەوە لە بەردەم ئەو دەرگایەدا هەڵتروشکابووم.. وام هەست دەکرد، هەموو ئەوانەی بەبەردەممدا گوزەر دەکەن، نامبینن یان نەیاندەویست بمبینن.

نمەی باران تێکەڵ بەفرمێسکە ساردەکانم دەبوو، کە دەمێک بوو پێڵووەکانیان تەڕ نەکردبووم.. بایەکی ساردیش گەمەی بەگەڵا زەردەکان دەکرد، کە دەمێک بوو نەمڕوانیبووە وەرینیان.

پێش ئەوەی ئەوێ جێ بهێڵم کەللەسەرەکە سەرنجی ڕاکێشام و ڕوانیمە قۆچێکی شکاوی کە ئەوەندەی تر سەر و سیمای خەمناک و بێزار کردبوو.. نازانم بۆ وا هەستم دەکرد، ڕەنگە من ئەو قۆچەیم شکاندبێت .. کووچە و کۆڵانەکان نەیاندەناسیمەوە و سامێکی ترسناکم لە پێچ و پەناکاندا دەدیتەوە. دەبوو خێراتر لەو گەڕەکە شوومە هەڵبێم، هەنگاوەکانم خێراتر کرد و لە بەردەم کڵێساکەدا هێور بوومەوە و ڕوانیمە ئەو خاچەی کە قەبارەی لە جاران بچووکتر ببۆوە و شوێنەکەشی گۆڕابوو.

من تەنها پێنج ساڵ ئەو ماڵ و گەڕەکەم جێ هێشتبوو.. بەڵام نازانم بۆ وا هەستم دەکرد کە سەدەیەک بێت؛ تەنها سەفەرێکم کردبوو، دەشبوو ئەو سەفەرەم هەر کردبا!؟

قسەی سەرۆک تیمەکەم هاتەوە یاد:

(- دکتۆر، دەبێت ئەو شتانەی کە دەیبینیت و ئەوانەشی کە پێی هەڵدەستیت، تەنها نهێنییەک بێت و هەرگیز نەیدرکێنیت.

- بێگومان..

- دەبێت ئاگادار بیت، درکاندنی مەترسی بۆ سەر ژیانت هەیە، یان رەنگە......!؟)

پێش ئەوەی سەفەرە سەیروسەمەرەکەمان دەست پێ بکات، لە ژوورێکی دووره دەستی قەراغ شاردا، شەوێکم بردە سەر و تا رۆژ بۆوە هەر نەخەوتم . نازانم بۆ تەنها ئاکاری دێڵە سەگێکم دەهاتە بەرچاو کە لە هەموو جێگەیەکی ژوورەکەدا هەبوو.. بەڵام سەیر لەوەدا بوو کە تێی نەدەڕوانیم!؟ پێش ئەوەی قاتە رەشەکەم لەبەر بکەم و ژانتاکەم بپێچمەوە، ونبوونی گۆرەوییە سپییەکانم لا بووە کێشە و تا ئێستا لە نهێنی ونبوونی تێ نەگەیشتم!

بەیانی چەند ئۆتۆمبێلێک، لە بەردەرگای ژوورەکەدا راوەستان و بەپێی بەتی پەلکێشیان کردم و منیان لە ئۆتۆمبێلێک هاویشت. کە شۆفێرەکەی گزگلێک بوو، بەئەستەم پێشەوەی خۆی دەبینی.. هیچ هەستم بەترس نەکرد و دوودڵیش نەبووم، دڵنیا بووم لەوەی کە ئەمە یەکێکە لە تاقیکردنەوەکانی سەرۆکی تیمەکەمان.. نازانم چەند جێگە و شوێنمان کرد و لە کوێشەوە چووینە کوێ؛ چونکە بەدرێژایی سەفەرەکەم خەوتبووم، یان دەمویست وەک خەوتوویەک خۆم پیشان بدەم!؟

هێندەم خۆش بوو، تا خۆم لە گۆڕەپانێکی گەورەدا بینییەوە..

حەشامەتێک پێشوازییان لە تیمەکە کرد و لە هەموویان وردبوونەوە، تەنها لە منیان نەڕوانی، ڕەنگە لەوێ نەبووبێتم؟!

هەموویان دانیشتن؛ تەنها من نەبم.. چونکە کورسییەکان بەقەدەر ژمارەی ئامادەبووەکان بوو.. گەرچی بە زۆر زمان لەوێدا قسە و باس دەکرا، بەڵام لەوە حاڵی بووم کە باسی تاوانێکی ناوازە دەکرێت و تاوانبارەکەشی لەوێدا ئامادەیە. هەرکە باس لە تاوانبارەکە دەکرا، کامێراکان وێنەیان دەگرتم و پەیامنێرەکانیش دەنگیان زوڵاڵتر و قەویتر دەبوو، پرسیارەکان هێندە زۆر بوون کە چەندەها پرۆفیسۆر و پیاوی کارامە فریای وەڵامدانەوەی نەدەکەوتن؛ نازانم چەند خەوتم، بەڵام دەزانم خەونێکی سەیرم بینی...

(لە هۆڵێکی گەورەدا خۆم و تیمەکە دەمانڕوانییە جەستەی کچۆڵەیەکی تازەپێگەیشتوو... پاش ئەوەی ڕاپۆرتێکیان لەسەر حاڵەتی ناوازەی ئەو کچۆڵەیە خوێندەوە و ئاماژەیان بەنەبوونی ڕێگاچارە کرد و فەشەلی زانستیان ڕاگەیاند، نەشتەرگەرییەکەیان بەمن سپارد و پاش تاوێک هەر من و ئەو جەستەیە لە ژوورەکەدا ماینەوە...)

کەڵلەزلێک شتێکی پێداکێشام و بێداری کردمەوە.. سەرۆک تیمەکە لێم نزیک بۆوە و پەڕەیەکی نووسراوی دایە دەستم و فەرمانی پێ کردم کە دەبێت بیخوێنمەوە؛ بێ سێ و دوو کەوتمە خوێندنەوەی ئەو پەڕەیە و تەواو دەنگم هەڵبڕی:

(- بەڕێزان ئەو کچۆڵەیەی کە پێشتر باسی لێوە کرا، تەنها جەستەیەکی ساف و لووس بوو.. هیچ کونۆچکەیەکی دەردانی ئارەق لە جەستەیدا نەبوو، هەر بۆیە تەنها لە میانی زمانییەوە کە بەردەوام لە دەرەوە بوو هەناسەی دەدا.. منیش پاش ئەوەی نەگەیشتمە هیچ

ئەنجامێک زمانیم گەست).

پاش تەواوبوونی قسەکانم، بۆ ساتێک گوێم لە هیچ دەنگێک نەبوو.. پاشان سەرۆکی تیمەکە نەڕاندی:

(- کەس گوێی لە هیچ نەبووە، دەبێت بەدەنگێکی بەرز و ئاشکرا دووبارەی بکەیتەوە).

چەند جارێک بەدەنگی بەرز دەقی نووسراوەکەم خوێندەوە و کەس گوێی لە هیچ نەبوو، بەڵام خۆم بەباشی هەموو وشەکانم دەبیست.. سەرۆک تیمەکە و چوار کەسی تر، لەوەدا بوون کە پانتۆڵەکەم دابکەنن.. نازانم چۆن بوو گوتم:

(- مەکەن...).

سەرۆک تیمەکە سەری ڕاوەشاند و گوتی:

(- ئەوەتانێ دەنگت هیچ عەیبی نییە!؟).

ئەمجارەیان بەخێرایی کەوتمە قسە و گوێم لە هیچ وشەیەکی خۆم نەبوو.. بەڵام بەئاکار و سەر و سیمای حەشامەتەکەدا دیاربوو، گوێبیستی بەسەرهاتی تاوانەکەن: ئەو تاوانەی کە نەمدەزانی کەی و چۆن ئەنجامم داوە.

دەموچاوەکان گۆڕان و پاشان بوونە سەدەها لافیتە و پۆستەری ڕەش.. وەنەوز پێڵووەکانی پێ داخستم و نازانم چۆن لە نێو ئەو گۆڕەپانەدا خەوتم.. ئەوەندە دەزانم پاش بێداربوونەوەم، هیچ شوناسنامە و بەڵگەیەکم لە گیرفانی خۆمدا نەبینییەوە تا بزانم من کێم و...

بەڕێکەوتیش کەسێک کە نەمدەناسی منی لەوێوە گەیاندە ئێرە..

بێهوودە بەشوێن شتێکدا دەگەڕام، کە نەمدەزانی چییە؟

بۆ کەسێک دەگەڕام کە نەمدەزانی کێیە.. بەشوێن ماڵێکدا دەگەڕام کە تەنیا لە خەونمدا بینیبووم!؟

پاش شەش مانگ گەڕان لەو شارەدا، کچێکی پرچ سوور بەبێ ئەوەی لەگەڵمدا بدوێ ڕۆژنامەیەکی کۆنینەی دامێ.. مێژوو و ژمارە و ناونیشانەکەیم بۆ نەخوێندرایەوە، یان ڕاستتره بڵێم شتێکی لەو بابەتەی لەسەر نەنووسرابوو.. تەنها مانشێتی ئەم هەواڵەم بەچاکی دیتەوە:

(دکتۆرێک لە عیادەکەیدا تەعەدا لە نەخۆشێکی خۆی دەکات و پاش دوو کاژێریش نەخۆشەکە گیانی لە دەست دەدا).

هەواڵەکە هیچ نەیورووژاندم و هیچیشی لا دروست نەکردم.. هێندە نەبێت لەو ڕۆژەوە بەردەوام کووچە و کۆڵانەکانی شار دەگەڕێم و بێهوودە بەرامبەر دەرگا کۆنینەکان ڕادەمێنم و لە ئاکاری هەموو پیادەڕەوەکان ورد دەبمەوە.. دەستی پیرێژنەکان ماچ دەکەم و لەگەڵ پیرەمێردانیش گوزەر دەکەم.

لە پاش بینینی مانشێتی ئەو ڕۆژنامە کۆنینەیە، جار جارە ئاکاری ئەو دێڵە سەگەم دێتەوە یاد کە بەمنداڵی پاش ئەوەی ڕاکە ڕاکەی گەرەکم پێ دەکرد، زمانی بستێک دەهێنایە دەر و منیش هەر ڕەحمم پێ نەدەکرد...

بەبەردەوامی دەگەڕام و چاوم دەگێڕا..

دەچوومە نێو حەشامەتەکان و سەیر لەوەدا بوو، باس لە من نەدەکرا.. لە لافیتە و پۆستەرەکان ورد دەبوومەوە و ناوی خۆم

ئەدەدیتەوە؛ بێجگە لەو ڕۆژنامەیەی کە بێ ژمارە و ساڵ و ناونیشان بوو، لە هیچ ڕۆژنامەیەکی کۆنینەی تردا باس و خواسی خۆم نەکەوتە بەرچاو.

لە شەوێکی ئەنگوستەچاودا، بەڕێکەوت لە یەکێک لە کەلاوەکاندا گیرسامەوە و پاش ئەوەی تاوێک لە دەرگایەکی کۆنین ڕامام.. نازانم چۆن بوو، دوا قسەی کەسێکم وەبیر هاتەوە کە لە شەوێکی ئاوادا و لە نێو یەکێک لە ژێرزەمینە تاریکەکاندا، زۆر بەدڵنیاییەوە پێی گوتم:

(تازە تۆ ئەودیو دەرگا کۆنینەکە نابینیتەوە...).

# وەک وەبیرم دێتەوە

وەک وەبیرم دێتەوە، بارەش لە گشت لایەکەوە، گاڵەی بەخۆڵی سەر عەردی پێدەشتەکە دەکرد و سەرجەم ڕیزە درەختی نێوەڕاستی پێدەشتەکەی خستبووە هەڵەکە سەما.

چین بەچین، خۆڵی پێدەشتەکەی دەبردە ئاسمان و پاشان بەچەشنی خۆڵباران.. دادەبارینە خوار، گەڵای بەهیچ کامێک لە درەختەکانەوە نەهێشتبوو کە جار جارە و تاک و تەرا، لەگەڵ خۆڵبارانەکەدا.. دەهاتنە خوار و پێش ئەوەی بەتەواویی بکەونە سەر عەردی پێدەشتەکە بەرزی دەکردنەوە و ڕاپێچی نێو ئەو گەردەلوول و هەرا و بەزمەی ئەو ساتەوەختەی دەکردن، زۆری خایاند تا برێک هێور بووەوە و کەمێک ئاغرتر کەوتە وێزەی هەر چییەک کە لەوێدا دەستی پێڕادەگەیشت.

گەرچی لە نێو هەموو ئەوەدا بووم، کە لەو کاتەدا ڕووی دەدا، بەڵام هەروەک ئەوەی کە لەوێدا نەبم، بارەشەکە نە ئەوە بوو بەگژمدا بێت و

نە ئەوەش بوو، لە پشت و ئەملا و ئەولامەوە، گوشار بخاتە سەرم و باڵم پێوە بنێت، بەڵکو لاقەی شەپقەکەی سەریشی نەدەکردم و بەئاسماندا هەڵی نەدەفڕاند.

وەک وەبیرم دێتەوە، لەو کاتەدا قسەکانی ئەو ژنە جادووگەرە عەیارەم وەبیر هاتەوە کە لە ڕۆژێکی تەماویی، ئەو شارەی کە دە ساڵی تەمەنم تێدا بەسەر بردبوو..

پێی گوتبووم: (تۆ وەک عیفریتی حەکایەتە دێرینەکان، بەسیحری ساحیرێک.. خراویتە نێو شووشەیەکەوە تا ئەو ڕۆژەی یەکێک بەڕێکەوت سەرەکەی دەکاتەوە.. مەحکومیت بەمانەوە لە نێویدا ...). ئەم ئێوارەیەی کە ئەوم تێدا جێ هێشت.. بەتەواوی هەستم بەپەستان و گوشاری بارەشەکە دەکرد، بەتایبەت ئەو دەمەی لە شارە دێرینەکە ترازام و ڕێگەی لاتەنیشتی ڕیزە درەختەکەی نێوەڕاستی پێدەشتەکەم گرتە بەر..

ئەو دەمەی کە لە کۆڵانەکەی نزیک ماڵیاندا، ماڵئاواییم لێ کرد.. جەستەی سارد هەڵگەڕا و توندتر دارشەقەکەی لە بن باڵی قایم کرد، دوای ئەوەی چەند شەقاوێک لێی دوور کەوتمەوە، بۆ دوا جار ئاوڕم لێ دایەوە و تەماشام کرد هەروەک ئەوەی پاش پەنجا ساڵ ئاوڕم لێ دابێتەوە و تێم ڕوانیبێت، ئاوا دەموچاو و پرچەکانی گۆڕانیان بەسەردا هاتبوو، جگە لەوەی کە لە جێی چاوە ڕەشە، زۆر گەورەکانیشی.. دوو شوێن زامی قووڵ جێ مابوون کە دڵۆپ دڵۆپ و هێدی هێدی فرمێسکێکی ڕەشیان لێ دەهاتە دەر.

کە بەتەواویی پشتم تێ کرد و کۆڵانەکەم جێ هێشت و گەیشتمە سووچی سێ ڕیانەکە، گوێم لە زریکە دەنگێکی شێنانە بوو.. کە پێ

نەدەچوو قورگی هیچ کەسێک، دەنگی بەو چەشنەی لێ بێتە دەر. لە نێوەڕاستی سێ ڕیانەکەدا، پیرەژنێکی پشت کۆمم کەوتە بەرچاو، کە لەو ساتەوەختەدا قاپێ ژیلەمۆی ڕۆ دەکرد... داپیرەشم لە زۆر ئێوارەی شەممەدا هەروەک ئەو پیرەژنەی دەکرد و پاشان سێ بەردی بەهەرسێ لادا فڕێ دەدا و چاوەڕێی بیستنی یەکەمین ئاخافتنی، یەکەمین کەسێکی دەکرد، کە لەو ئان و ساتەدا بەوێدا تێپەڕبایە، زۆر لەو کەسانەی کە داپیرەمیان دەناسی و دەیانزانی نیازێکی لە دڵ گرتووە و شەمۆڵەی بۆ دەگرێتەوە.

بۆ تووڕەکردنی کە بەو ئاستەدا گوزەریان دەکرد.. هیچیان نەدەگوت یاخود دەیانگوت: (نابێت و ڕێی تێ ناچێت).

ئیدی داپیرەم لەو کاتەدا، زۆر زویر و بێ تاقەت دەبوو، هەر یەکسەر ئەو ناوەی جێ دەهێشت و دەگەڕایەوە نێو ئەو خانووە نسرمەی، کە هەر حەوت براکەم و دایک و باوکمی.. تێکڕا لە یەک ڕۆژدا تێدا مردبوون.

تەنها من و داپیرەم، لە کاتی مردنی ئەواندا، لەوێ نەبووین و نەمردین دواتر نە ئێمە و نە هیچ کەسێکی تریش هۆکاری ڕاستەقینەی مردنیانی، بۆ ساغ نەبۆوە.

پیرەمێردێکی بەساڵاچووی گەڕەکەکەمان پاش چەند ساڵێک لە مەرگیان.. لە نیوەڕۆی هاوینێکی گەرمدا، پێی گوتم:

(بابت هاتۆتە خەونم و پێی گوتووم، کە ڕەشمارێک لە بنمیچی یەکێک لە ژوورەکانی خانووەکەتانەوە، هاتۆتە خوارەوە و یەکە یەکەیانی گەستووە).

بەڵام هەر دواتر خودی پیرەمێردەکە.. خەونێکی دیکەی بۆ گێڕامەوە، کە گوایە بەپێی ئەو خەونەی، ڕوحێکی شەڕانگێز و شەیتان ئاسا.. لە سووچێکی خانووەکەمانەوە، لێیان وەدەر کەوتووە و ئەوانیش لە تاو ئەوەی، کە دەنگیان دەرنەچێت و کەس هاوار و فوغانیان نەبیستێت، بەهەردوو دەستان زار و کەپووی خۆیان گرتووە و یەک لە دوای یەک هەناسەیان لێ براوە و خنکاون.

وەبیرم دێتەوە.. لەو کاتەدا، بەپیرەمێردەکەم گوت:

(باشە بۆ دەبێت، نەیانویستبێت دەنگیان دەربچێت).

پیرەمێردەکە لە وەڵامدا گوتی: (ڕەنگە لەو سەردەمەی کە ئەوانی تێدا ژیاون هاوارکردن و دەنگە دەنگ قەدەغە بووبێت)

داپیرەم لە پاش مردنی ئەوان، جگە لەو کاتەنەی کە داوای خوێندنەوەی کتێبە پیرۆزەکەی لێ دەکرم.. هیچ قسەی نەدەکرد، ئەو دەمانەی کە یەکێک لە بەشەکانی کتێبە پیرۆزەکەشم بۆ دەخوێندەوە.. چاوەکانی بریسکەیان تێ دەزا و دەنکە مورووەکانی تەزبیحەکەی دەستیشی، ڕەنگی دەگۆڕرا.

بەڵام پێش ئەوەی کە بمرێت، نە داوای خوێندنەوەی کتێبە پیرۆزەکەی لێ کردم و نە وەک هەموو کاتێک تەزبیحەکەشی بەدەستەوە بوو.

پاش مەرگیشی هەر لە خۆمەوە.. ماوەیەکی زۆر گەڕام بەشوێن تەزبیحەکەیدا... بەڵام لە هیچ جێگە و شوێنێکی ماڵەکەدا نەمدۆزییەوە.

دەنگی ناقوڵای باڵندەیەک کە نەمدەزانی لە کوێوە دەنگی دێت،

زریزەی خەیاڵەکانی پساندم، کە سەرم هەڵبڕی و ڕوانیمە پێدەشتەکە، سێبەری باڵندەیەکی گەورە، سەرپاکی ڕووبەرێکی بەرفراوانی پێدەشتەکەی داگیر کردبوو.

دەستم کرد بەگیرفانمدا نامەیەک و چەند وێنەیەکی فۆتۆگرافی گۆڕەکەی ئەوم، هێنایە دەر.

سەیر لەوەدا بوو، هیچ وێنەیەکیان، لەو وێنەیە نەدەچوو کە ژنە جادووگەرەکە، پاش حەکایەتێکی دووردرێژ، لە خەیاڵمدا بەرجەستەی کردبوو.

بەپێی قسەکانی، گوایە ئەویان بەدارشەقەکەیەوە، لە گۆڕێکی حەوت مەتر پان و دوو مەتر درێژدا ناشتووە، تا هەر پیادەڕەوێک کە بەلایدا تێبەڕ ببێت بەمەبەستی زانینی بەسەرهاتی ئەو گۆڕە سەیروسەمەرەیە، بچێتە زیارەتی و نووسراوی سەر هەردوو کێلەکەی بخوێنێتەوە کە گوایە هەر کەسێکی بێگانە بەشارەکەی ئەو، ئەگەر مەبەستی بێت، دێرە نووسراوەکانی سەر کێلەکانی گۆڕەکەی ئەو بخوێنێتەوە چاوی ڕەشکەوپێشکە دەکات و بۆ تاوێک هیچ نابینێت، وەک ژنە جادووگەرەکە بۆی گێڕابوومەوە، نووسراوی سەر هەردوو کێلی گۆڕەکەی ئەو.. هیچ کەسێک لەوانەی کە خوێندوویانەتەوە، هیچی لە بارەوە ناڵێن و لەبەر هەر هۆیەک بێت، هیچ لە لوغز و پەنهانەکانی نادرکێنن.

بەو پێیەی کە برادەرەکەم، لە نامەیەکیدا بۆی نووسیبووم، گۆڕەکەی ئەو دەکەوێتە بەشی سەرووی ڕیزە درەختەکانی نێوەڕاستی پێدەشتەکە.

پاش کەمێک هێوربوونەوەی بارەشەکە کە هەستامە سەرپێ، بەتەواوی هەستم بەئێش و ئازاری خۆنووشتانەوە و خۆ جێکردنەوە دەکرد؛ لە کچکە شووشەیەکی ئەفسووناویدا. پاش کەمێک ڕێکردن.. لە پاڵ ڕیزە درەختەکاندا ڕاوەستام و چاوم بۆ تاکە کەلایەک گێڕا، کە لە ژێریاندا کەوتبێت، نەدەکرا بارەش هەر هەموویانی، لەگەڵ خۆیدا بردبێتە شوێنێکی تر و تاکە گەلایەکی بۆ ژێر خودی درەختەکان نەگەڕاندبێتەوە.

بێ وچان، نزیکەی سەعاتێک ڕێم کرد و ڕیزە درەختەکان تەواو نەبوون.

هەر دەتگوت لەگەڵ هەر هەنگاوێکمدا، درەختێکی نوێ دەچێتە بەشی سەرەوەی درەختەکان و ڕیزە درەختەکانم لێ درێژتر دەکات!؟

بەبێ وچان و پشوو، خۆم گەیاندە ئەو شارەی کە ماوەی دە ساڵی ژیانم تێدا بردە سەر، تا بڵێی شارێکی تەماویی و سەیر بوو تەنانەت بۆ جارێکیش لە نێو شەقام و کۆڵان و کووچەکانیدا سیما و ڕووکاری هیچ کەسێکی نێو شارەکەم نەکەوتە بەرچاو.

تەنانەت ئەو خاوەن کارەی کە کاریشم لا دەکرد، هیچ کاتێک نەیدەهێشت ڕووکاری ببینم ئەمە جگە لەوەی سەرجەم کرێکارەکانی ئەو شوێنەی کە کاریشم تێدا دەکرد، هەمیشە دەمامکیان لە دەموچاو دەکرد، گەر زۆر مەبەست و پێویستیش بایە، شتێکم تێ بگەیەنن.. بەپێچەوانەی خاوەن کارەوە، کە لەگەڵم دەدوا، ئەوان تەنها بەئاماژە و نیشارەت تێیان دەگەیاندم.

هەموو ئەوەی کە دەمبینی و تێیدا دەژیام، هێندەی تر گڕ و تینیان

دەدایە بڵێسەی ئەو ئازارە ویژدانییەی کە هیچ کاتێک لە ناخمدا خەفە نەدەبوو.

هەردەم هۆکاری جێهێشتنی ئەوم، لا دەبووە پرسیار و هیچ وەڵامێکم بۆ نەدەدۆزییەوە.

بەشێکی نامەکەم بیر کەوتەوە.. کە برادەرەکەم بۆی نووسیبووم:

(پاش ئەوەی کە جێت هێشت... بەسەرپۆشێکی سپی تاکە ئاوێنەیەکی نێو ماڵەکەی خۆیانی داپۆشی و لە گچکە هۆدەیەکی ماڵەکەیاندا، کەوتە خوێندنەوەی هەر پەنجا و دوو بەشی کتێبە پیرۆزەکە کە گوایە بەپەنجا و دوو هەفتە لە خوێندنەوەی بۆتەوە!؟

وەک بۆیان گێڕاومەتەوە، لە شەوە زۆر تاریکەکاندا... ماڵەکەی شەوق و نووری لێ باریوە و هەموو خەڵکی گەڕەکەکەیان، دەنگی گفتوگۆی فریشتەکانیان هاتۆتە گوێ.. ئیدی هێدی هێدی، نەک خەڵکی گەڕەکەکەیان بەڵکو زۆربەی خەڵکی شارەکەش، باوەڕ و قەناعەتیان بەپیرۆزێتی و موبارەکیی ئەو هێنانەوە و بۆ زۆر کار و نیازیان دەستەودامێنی بوون.

وەک بۆیان گێڕاومەتەوە، گوایە باخچەی ماڵەکەی، لە کون فەیەکونێکدا بۆتە بەهەشتێکی ڕازاوەی پڕ لە گوڵ و گوڵزاری سەیروسەمەرەی بۆندار.

گوایە پەپوولەکانی نێو باخچەکەی، هێندەی نەورەسێک گەورە بوون، ڕەنگی باڵندەکانیشی هەموو کەسێکی حەیران و شەیدا کردووە، دەنگی خوێندن و جریوەشیان، کەسانی شێت و دەمارگیری پێ ساکین و ئاقڵ بووە.

ئیدی لەسەر داوای ئەو، سەرجەم خەڵکی گەڕەک و زۆر لە خەڵکی شارەکەش، ئاوێنەکانی نێو ماڵەکانیان بەسەرپۆشی سپی داپۆشیوە و ببڕای ببڕ، لەو کاتەوە.. لە شێوە و ئاکاری خۆیانیان نەڕوانیوە.

پێش چەند ڕۆژێکیش لە مردنی، داوای هەڵکەندنی گۆڕێکی حەوت مەتر درێژ و دوو مەتر پانی، لە چەند کەسێکی دیندار و نزیک بەخۆی کردووە و پێی گوتوون، کە دەبێت پاش مردنی، لەوێدا بینێژن و لەسەر هەردوو کێلی گۆڕەکەشی، ئەو دێرە وشانە هەڵبکەنن و بنووسن، کە بەنووسراوی لە کاغەزێکدا داویەتە دەستیان.

سەرم هەڵبڕی و ڕوانیمە ئەو ئاسمانەی کە لەو کاتەدا هیچ ڕەنگێکی نەبوو. بێهوودە ببووم لە تەواوبوونی ڕیزە درەختەکان، چەند دەڕۆیشتم هەروەک ئەوەی کە هیچ ڕێم نەکردبێت؛ ئاوا دەهاتە پێش چاوم.

لە ئێوارەیەکی تەماویدا، ژنە جادووگەرەکە پێی گوتم:

(ئەگەر دەتەوێت، لە ئازاری ویژدان و دڕدۆنگی و نیگەرانی بەردەوامت ڕزگارت بێت، بگەڕێوە.. گۆڕەکەی بدۆزەرەوە و تێر تێر بگری).

خێراتر کەوتمە هەنگاونان و ڕۆیشتن..

دەبوو پێش ئەوەی شەودا بێت، بگەمە سەر گۆڕەکەی، بەڵام درێژبوونی ڕیزە درەختەکان، ئەو گەیشتنەیان لێ دەکرمە مەحاڵ و تا دەهات زیاتر شێتگیر و هاریان دەکردم.

تەنانەت کەوتمە گومان لەوەی کە بەڕاستی گەڕابێتمەوە و لە پێدەشتەکەدا بم وەک وەبیرم دێتەوە، لەو کاتەدا گوتم:

(تۆ بڵێی نەخەوتبێتم و خەون بەگەڕان بەشوێن گۆڕەکەیدا نەبینم).

گەرچی دڵنیا بووم لە بوونی پێدەشتەکە و ڕیزە درەختەکان و گۆڕەکەی ئەویش، بەڵام نەدەکرا لە ڕاستیدا بەو چەشنە بێت، کە من دەیبینم؟!

نەدەکرا هەنگاوەکان، هیچ لە دووریێتی نێوان من و گۆڕەکەی نەگۆڕێت!؟

ویستم بەنێو درەختەکاندا بچمە ئەودیو و لەوێوە بڕوانمە ئەو شوێنەی کە دەبوو گۆڕەکەی لێ بێت، لەبەر خۆمەوە گوتم:

(ڕەنگە لە دیوی ئەودیوی ڕیزە درەختەکانەوە، گۆڕەکەیم لێ وەدەر کەوێت!؟)

بەڵام بەهیچ خۆم پێ ئاودیو نەکرا، پاش ئەو بڕیارەم، هێندە درەختەکان لە یەکتر نزیک بوونەوە، کە مەحاڵ بوو، مێرووڵەیەکیش بەنێویاندا بچێتە ئەو دیوەوە...

لە ناکاو بارەش تین و تاوی دایە بەر خۆی و چینێ خۆڵی پێدەشتەکەی بەحەوادا برد، پاش تاوێک بەچەشنی خۆڵباران ڕۆی کردە خوار.

ئەمجارەشیان هەروەک ئەوەی لە نێو شووشەکەدا بم، نەک هەر هەستم بەبارەشەکە نەدەکرد، بەڵکو گەردی خۆڵیش، بەر هیچ شوێنێکی جەستەم نەدەکەوت.

لەبەر خۆمەوە گوتم:

(ڕەنگە بەڕاستی لە نێو شووشەکەدا بم!؟)

دەستم بەچواردەوری خۆمدا گێڕا و هەستم بەهیچ لەمپەرێک نەکرد، پێیەکانم بزواند.. زۆر بەئاسایی بۆم دەبزوا و هەنگاوم دەنا. کەوتمە ڕێ و دەیان جـــار لە یەکـــەوە تا ملیـــۆنێکم ژمـــارد، بەڵام نەک هەر نەگەیشتمە بەشی سەرووی درەختەکان، بەڵکو هیچ پێ نەدەچوو، کە لە شوێن خۆم جووڵابێتم.

ئیدی بێهوودە لە شوێن خۆمدا هەڵترووشکام.

هەروەک ئەوەی لە نێو شووشـەیەکدا بم، خـۆم گرمـۆڵە کرد و ئۆقرەم گرت، پاشان پێڵووە قورسبووەکانم لێک نا و خەوتم.

لە خـــەونمدا، مـن و ئەو، لە نێـــو کـــۆڵانەکـــانی شـــارێکی تاریکدا ڕامـاندەکرد.. کە عەردەکەی وردە شـووشـەی لەسـەر ڕۆ کرابوو، پاش ئەوەی حـەوت جار پێمان زامدار بوو، کە بەحـەوت تەبەقەی عـەرددا ڕۆ چووبووە خوار...

هەرکە کەوتینە بنی بیرەکە.. بەترسـەوە پێڵووەکانم ترازاند و چاوم بۆ ئەو گـێـڕا، بـەڵام هەروەک ئەوەی کـە لەگـەڵمـدا نەبـووبێت، لە هـیچ شـوێنێکەوە لێم وەدیار نەکـەوت، لە نـاکـاو ژنە جـادووگـەرەکـەم هاتە بەرچاو.

کـــە زۆر بەهێـــمنی لێم هاتە پێش و ســـاتێک بەهەردوو دەســـتی چاوەکـــانمی گـــرت، کـــە دەســـتی لادا.. مـن و ئەو بـەڕووتی لـە نێـــو شـووشـەیەکدا بـووین.. پرچەکانی ژاکاو و جـەسـتـەی ئارەقاوی بوو.. پاش ئەوەی کـە بۆ تاوێک تێی ڕوانیم لە شـوێن خـۆیدا وەک مـۆمـێک توایەوە و هێندەی نەبرد لە بەرچامـدا ون بـوو. کـە وەئاگـا هـاتمەوە، هێشـتـاکـە لە هەمـان شـوێنی پێشـووی خـۆمـدا بووم. وەک وەبیـرم

دیتەوە.. هەر ئەوەندەی لەبەر خۆمەوە گوتم:

(ناکرێت چیدی بەشوێن گۆڕەکەیدا بگەڕێم).

خۆم لە هەمان ساتەوەختی ئەو ئێوارەیەدا بینییەوە، کە ئەوم تێدا جێ هێشت، لە کولانەکەی نزیک مالیاندا ڕاوەستابووم و مالئاواییم لە کەسێک دەکرد کە بەبالا هێندەی ئەو بوو، دەموچاوی بەسەرپۆشێکی سپی داپۆشیبوو.. هەمان دارشەقەکەی ئەویشی لە بن بالی گیر کردبوو.

لێی چوومە پێش و هەر لە خۆمەوە سەرپۆشە سپییەکەی سەریم لادا، جگە لە ئاوێنەیەک، هیچی دیکەم نەکەوتە پێش چاو، بەلام چەندم تێ ڕوانی.. شکل و شێوەی خۆمم نەبینی، هەروەک ئەوەی لە بەردەم ئاوێنەیەکدا ڕانەوەستابێتم و تێی نەڕوانم، نازانم ئەوێم چۆن جێ هێشت!!؟

ئیدی پاش ئەوەی هیچ نەما بیلێم و بیگێڕمەوە..

ڕوانیمە وێنە فۆتۆگرافییەکانی گۆڕەکەی ئەو کە تا بلێی سادە و ساکار بوو، پاش ماوەیەک تەمێک چواردەوری تەنیم و هەموو شتێکی لە بەرچاو ون کردم.

کە ویستم دەست بنێمە نێو تەمەکە.. هەستم بەوە کرد، کە لە نێو شووشەیەکدام.

چەندم کرد و دەستم گێڕا، کون و کەلێنێکم لە شووشەکەدا نەبینییەوە، لەبەر خۆمەوە گوتم:

(ڕەنگە هەر لە سەرەتای گەڕانم بەشوێن گۆڕەکەیدا.. یان هەر لەو ڕۆژەوە کە ژنە جادووگەرەکە پێی گوتم؛ کە خراومەتە نێو

شووشەیەک.. من هەر لێرەدا بوویێتم!؟

بەڵام پێ ناچێت ئەو شووشەیە کە لە نێویدام سەرێکی هەبێت، تا بەرێکەوت و ڕۆژێک لە ڕۆژان، کەسێک سەرەکەی بکاتەوە).

وەک وەبیرم دێتەوە، پاش ماوەیەک پێڵووەکانم لێک نا و خەوتم.

# واگۆنی ژمارە حەوت

بەتەنیا؛ دەمڕوانییە وێنەی نەگۆڕاوی ئەو بیابانەی کە کۆنە شەمەندەفەرەکەی پێدا تێپەڕ دەبوو، ئەو چرە دووکەڵە ڕەشەی، کە لە بەشی پێشەوەی شەمەندەفەرەکەوە بەرز دەبۆوە.. لە درز و کون و کەلێنی واگۆنەکەوە دەهاتە ژوور.

کە لە ئیستاسیۆنەکەدا سۆراغی شەمەندەفەری ئەو شارەم کرد... ئەمدەزانی هەفتەی یەک جار و تەنها یەک شەمەندەفەر بۆی دەچێت، ئەمە جگە لەوەی کە هێشتاکە مابێت ئیش بکات؛ چونکە پێشتر تەنها لە نێو فیلمەکاندا شەمەندەفەری ئاوا کۆنم بینیبوو.

دوای ئەوەی کە بلیتم بڕی و ماوەیەک چاوەڕێم کرد.. جگە لە خۆم هیچ کەسێکی دیکەم نەبینی؛ کە چاوەڕێی هاتنی شەمەندەفەرەکە بکات، بەپێی ژمارەی سەر بلیتەکە، دەبوو بچوومایەتە نێو واگۆنی ژمارە سیانزە، بەڵام بەو پێیەی کە هەموو واگۆنەکان چۆڵ بوون؛ هەر لە خۆمەوە چوومە نێو واگۆنی ژمارە حەوت، کە تەنها یەک کورسی لە

تەختە دروستکراوی دارزاوی تێدا بوو.

نازانم پاش ماوەیەک، شەمەندەفەرەکە کەوتە ڕێ.. یان پێم وابوو، کە کەوتووەتە ڕێ، چونکە پاش چەند سەعاتێکیش، جگە لەو چرە دووکەڵەی کە نێو واگۆنەکەی قانگ دەدا... هیچ هەستم بەجووڵەی شەمەندەفەرەکە و کەوتنە گەڕی مەکینەکانی نەدەکرد.

یەکەم جار بوو، سەفەر بۆ ئەو شارە بکەم.. کە وەک بەحەکایەت بیستبووم، خەڵکەکەی لە هیچ ئان و ساتێکدا، گەر بارانیش نەبارێ، بەبێ لەبەرکردنی جلی تایبەت و هەڵکردنی چەترەکانیان، ناچنە دەر، تەنانەت خانووبەرە و ساختمان و بیناکانیشیان وەک دەیانگێڕایەوە، بەشکڵ و شێوە، هەر بەچەتر دەچن.

پاش بیستنی ئەو حەکایەتانەی، کە لە ئێستادا وەبیرم نایەتەوە، کێ بۆی گێڕاومەتەوە... خۆم لێ دەبووە موسافیرێکی ئەو شارە و بەنێویدا دەگەڕام.

تەنانەت جارێکیان، لەبەر خۆمەوە گوتم:

«ڕەنگە خەڵکی ئەو شارە، زۆر سڵ لە ئاوی باراناو بکەنەوە».

ئەو جلە تایبەتییەی کە لەبەریان دەکرد، زۆر بەجلی ئەو کەسانە دەچوو کە دەچوونە بۆشاییی ئاسمان.

لە زیندە خەونێکدا.. هێندەی نەمابوو، بەبێ لەبەرکردنی جلی تایبەت و هەڵکردنی چەتر؛ لەو بینایە بێمە دەرەوە، کە نازانم بۆ چووبوومە نێوی...

بەپەلە دوو زەلام، منیان لە ژێر چەترەکانیان نا و جلە

داخــراوەکــانیــان تا ســەر سنگیــان دامــاڵی و پاش هەڵمــژینی هەناسەیەکی قووڵ.. یەکێکیان گوتی:

(دەبوو زانیــبــات، کــە بەبێ چەتر و ئەو چەشنە جلەی کــە هەمــوو کەسێکی ئەم شارە لەبەریدایە، چوونە دەرەوە قەدەغەیە. حەز دەکەم ئەوەشت پێ ڕابگەیەنم، کە بەدرێژاییی ژیانم.. هیچ کەسێکم نەبینیوە، کە لە جێگە و شوێنێکی دیکەوە، ڕوو بکاتە شارەکەمان).

بزەیەک کەوتە سەر لێوی و گوتی:

(تاکــە ڕێگەیەکی هاتنە شــارەکــەمــان، ئەو هێــڵــە ئاسنینانەیە کــە هەفتەی یەک جار، تەنها شەمەندەفەرێکی پێدا تێپەڕ دەبێت و درەنگ وەختانێک دەگاتە نێو کۆنە ئیستاسیۆنی شارەکەمان، بەو پێیەش کە ئەمڕۆ چوارشەممەیە، واتە دەبێت: دوێنێ گەیشتبێتە ئێرە.. باشە لە شارەکەی ئێمەدا، هیچ ئوتێل و میوانخانەیەک نییە و هیچ کەسێکیش بۆی نییە، کەسێکی نامۆ بەشارەکەمان داڵدە بدات و بیباتە لای خۆی، دوێنێ شەو، لە کوێ مایتەوە!!؟).

چەندم بیــر لێ کــردەوە، نەک هەر دوێنــێ شـــەو، بەڵکو پێــرێ و بەسرپێرێ شەویشم، وەبیر نەدەهاتەوە و نەمدەزانی لە کوێدا بووم.

پاش ماوەیەک، هەردووکیان لە دەرگاکە چوونە دەر و جێیان هێشتم، چاوێکم بەدیوارەکانی ژوورەکەدا گێڕا.

لە بەشی سەرەوەی دیواری دەستە ڕاستدا، نووسرابوو:

واگۆنی ژمارە حەوت.

هێندەی نەبرد، هەردوو زەلامەکە هاتنە ژوورێ و چەترێک و دەستێ

جلی لەوەی خۆیان دامێ.

لە جامی تەڵخی واگۆنەکەوە، ڕوانیمە بیابانەکە هەمان دیمەنی نەگۆڕاوم، کەوتە بەرچاو.

وەک هەمیشە، کاتژمێرەکەی خۆم لە دەستدا نەبوو، هەر بۆیە نەمدەزانی کە چەند سەعاتە لە نێو واگۆنەکەدام.

لە دڵی خۆمدا گوتم:

(تۆ بڵێی ئەمجارە بەڕاستی بەرەو ئەو شارە بچم کە پێشتر تەنها بەخەیاڵ و لە زیندە خەونەکانمدا، بۆی دەچووم!؟).

جارێکیان، لە یەکێک لە پەرستگاکانی ئەو شارەدا.. کچۆڵەیەکم بینی؛ کە لە بەردەم پەیکەری پیاوێکی زۆر ناشیرین و دزێودا دەگریا، لەو کاتەدا بیرم لە هەموو ئەو کچۆڵانە کردەوە، کە بەدرێژایی ژیانم، حەزم لێ کردبوون؛ هیچیان لەو نەدەچوون!؟ ڕەنگی چاو و پرچەکانی زۆر نائاسایی بوون.. لێوەکانی تا بڵێی گۆشتن و پڕ بوون.. باڵا بەرز و باریک بوو. ڕەنگی دڵۆپە فرمێسکەکانی بنەوشەیی و قەبارەشی زۆر لە دڵۆپە فرمێسکی بنیادەمی ئاسایی، گەورەتر بوون، ئەمە جگە لەوەی، کە هیچ کاتێک ئاگاداری گریانی هیچ کامێک لەو کچانە نەبووم، کە پێشتر حەزم لێ کردبوون!؟ هەرچۆنێک بوو، خۆم لێی نزیک کردەوە و گوتم:

«بۆ دەگریت؟!»

پاش ئەوەی بۆ چەند جارێک، هەمان پرسیارم دووبارە کردەوە؛ گوتی: (کێ هەیە، لە حزووری زاتێکی موبارەکی وادا نەگریێ!؟)

هەر بەمەبەستی دواندنی گوتم:

(ڕاستە، منیش هەر بەمەبەستی زیارەتکردنی ئەو.. خۆم گەیاندۆتە ئێرە).

بۆ ماوەی سەعاتێک.. دوور و نزیک، چاودێری کچۆڵەکەم کرد. هەرکە پەرستگاکەی جێ هێشت، وەدووی کەوتم... بەڵام بەو پێیەی کە تێکەڵ بەکۆمەڵێ پیادەڕەوی دیکە بوو؛ کە هەر هەموویان هەمان جلی هاوشێوەی ئەوەی ئەویان لەبەردابوو. جگە لە چەترە لێکچووەکانیان؛ هەر بۆیە، لەگەڵ پیادەڕەوەکانی تردا.. لێم تێکەڵ بوو، دوای ماوەیەک، بەبەردەم باخچەیەکدا ڕەت بووم. سەرەتا کە لەسەر شۆستەکەی بەردەمییەوە تێم ڕوانی... پێم وابوو، هەموو ئەو دار و درەخت و گوڵ و گوڵزارە عەجایبەی نێوی ڕاستەقینەن.

بەڵام کە بەنێویدا گوزەرم کرد.. سەیرم کرد، هەر هەمووی لە نایلۆن دروست کراون. چەند گەڕام، تاکە شتێکی ڕاستەقینە و سروشتیم، لە نێو باخچەکەدا نەدۆزییەوە. هیچ جۆرە باڵندەیەک، لەسەر لق و چڵ و پۆپی دار و درەختە نایلۆنییەکان، نەنیشتبۆوە. گەرچی لە هیچ شوێنێکی تری شارەکەشدا، هیچ چەشن و جۆرێکی باڵندەم بەرچاو نەکەوتبوو. لەو کاتەدا، شەقامەکانی شارەکەم هاتەوە پێش چاو کە هیچ جۆرە ئۆتۆمبێل و ماتۆڕ و پاسکیل و چوار چەرخەیەکی پێدا نەدەڕۆیشت.

شارێکی تا بڵێی کپ و خامۆش بوو، بەئەستەم گوێت لە دەنگێک دەبوو.. دوو زرتەزەلامی کەڵەگەت، دەرگای واگۆنەکەیان کردەوە و یەکێکیان بەباوەش، جەستەی مردوویەکی هێنایە ژوور.

بەرامبەر بەو کورسییەی کە لەسەری دانیشتبووم، لەسەر پەتۆیەک پاڵی خست.. دەرگاکەیان پێوەدا و پاش ئەوەی کەمێک لە جامی واگۆنەکەوە، سەیریان کردم.. لە بەرچاومدا، هەروەک ئەوەی غەیب بووبێتن.. لەپڕ دیار نەمان. کە ڕوانیمە دەموچاوی جەستە ڕاکشاوەکە؛ زۆر سەرسام بوو.. هەر بەتەواوی لەو کچۆڵەیە دەچوو کە بەخەیاڵ لە پەرستگای شارەکەدا بینیبووم. هەستامە سەرپێ و چەند هەوڵی کردنەوەی دەرگای واگۆنەکەم دا.. بەڵام بەچەشنێک لەو دیوەوە کلۆمیان دابوو.. مەحاڵ بوو پێم بکرێتەوە.

لەسەر کورسی نێو واگۆنەکە، دانیشتمەوە..

وام هەست دەکرد، کە هێدی هێدی، ڕەنگی جەستەکە زیاتر دەگۆڕێت و گۆشتی دەموچاو و پەنجەکانی، پەنماوتر دێتە پێش چاوم.

لە خۆمەوە گوتم:

(دەبێت چەند سەعات لەمەوپێش؛ خەوتبێتم!؟).

شەقامێکی ئەو شارەم هاتەوە پێش چاو.. کە دەیان کەس ڕۆژانە، بەجلی تایبەت و لە ژێر چەترەکانیاندا.. پیاسەیان پێدا دەکرد پێم وابوو.. لە نێو پیادەڕەوەکاندا، بەشوێن ئەو کچۆڵەیەدا بگەڕێم؛ کە لە نێو پەرستگاکەدا بینیبووم.

گوتم:

(تۆ بڵێی بۆچی هێندە عەوداڵی گەڕان بم بەشوێنیدا؟!).

جارێکی دی، ڕوانیمە جەستەی ئەو کچۆڵەیەی.. کە بۆنی گۆشتی گەنیاوی لێ دەهات. نەمدەزانی بۆ دەبێت لەگەڵ مندا و لە هەمان

واگۆنی ژمارە حەوتدا دایاننابێت. لەوەدا بوو کە لە جامی واگۆنەکەوە بڕوانمە وێنەی نەگۆڕاوی بیابانەکە کاتێک هەردوو زرتە زەلامە کەڵەکەتەکەی پێشوو، دەرگای واگۆنەکەیان والآ کرد و یەکێکیان گوتی:

(دابەزە !).

لەوە دابوو، کە داببەزم.. گوێم لە دەنگی یەکێکیان بوو:

(جەستەی کچۆڵەکەش لە ئامێز بگرە و لەگەڵ خۆتدا بیهێنە).

جەستەی ڕەق و تەقی کچەم لە ئامێز گرت و وەدوویان کەوتم، هەر دەتگوت، لە هەمان ئیستاسیۆنی پێشووی شەمەندەفەرەکە دام، تەنانەت ئەوەی کە بلیتی دەفرۆشت هەمان ئەو کەسە بوو، کە پێش ئەوەی بچمە نێو واگۆنی ژمارە حەوت، بلیتم لێ کڕیبوو.

بەپێپلیکانەیەکی دووردرێژدا سەرکەوتم و پاشان بەڕاڕەوێکی تاریکدا، ڕۆیشتم.. هێندەی نەبرد، خۆم لە بەردەم دەرگای هۆڵێکی گەورەدا بینییەوە کە بەدوویاندا چوومە ژوور، حەشامەتێک لە نێو هۆڵەکەدا چاوەڕێیان دەکرد جەستەی کچۆڵەکەم، لەسەر سەکۆی بەردەم حەشامەتەکەدا دانا.

لەوەدا بوو، کە لەسەر یەکێک لە کورسییەکانی نێو هۆڵەکەدا دابنیشم.

کاتێک، یەکێک لە ئامادەبووانی نێو حەشامەتەکە ئاگاداری کردم و گوتی: (تۆ دامەنیشە؛ بەرامبەر بەمێزی دادوەر، قنج و قیت ڕابوەستە). لە پشت مێزەکەوە، کابرایەکی بەتەمەن دانیشتبوو.. ڕووی تێ کردم و گوتی: (نەدەبوو، ئەو کچۆڵەیە... وەک لە پەرستگاکەدا

بینیت؛ بۆ وەدووی کەوتیت، بۆ بوویتە.. پاشان نەدەبوو!!؟).

بەسەرسامییەکەوە گوتم:

(رەنگە ئێوە پێتان وابێت،... چونکە لە راستیدا تەنها بەخەیاڵ...). دادوەرەکە گوتی:

(بەڵام ئەوە نییە، بەڕاستی لە نێو شارەکەی ئەودایت؟!).

لەوەدا بوو، کە شتێک بڵێم...

گوێم لە دەنگی، کەسێکی نێو حەشامەتەکە بوو:

(پێ ناچێت، نکوڵی لەوە بکەیت.. کە ساڵانێکی دوورودرێژ لە نێو ئێمەدا، ژیانت بردۆتە سەر).

پاش ماوەیەک، لە بێدەنگبوونی حەشامەتەکە و دوای ئەوەی دادوەر پێڵووەکانی لێک نا. هەر یەکێکیان، جلە تایبەتییەکانی خۆیانیان لەبەر کرد و چەترەکانیان بەدەستیانەوە گرت.

نازانم لەو کاتەدا، وەدوویان کەوتم، یان لە پێشیانەوە دەڕۆیشتم؟!!!

هەرچۆنێک بوو، پاش ماوەیەک، گەیشتینە نێوەڕاستی گۆڕەپانێکی نێو شارەکە، بەبێ ئەوەی لە جلە تایبەتییەکانی ئەوانم لەبەردا بێت، یان تەنانەت چەترێکیشم بەدەستەوە بێت؛ لەبەربارانێدا ڕایانگرتم.

نازانم چەند سەعات، یان چەند ڕۆژ و شەو.. لەوێدا ڕایانگرتم.. بەڵام پێم وانەبوو، دڵۆپە بارانەکان.. هیچ کارێکیان کردبێتە سەرم!؟ وام هەست دەکرد، کە لەبەربارانێکی ئاساییدا ڕاوەستاوم.. چەند دەستم بۆ دەموچاوی خۆم برد و لە پەنجەکانی دەستم ڕوانی؛ هیچ گۆڕانێکم نەبینییەوە. تەنها جیاوازییەکەی ئەم بارانە و ئەو بارانانەی

کە پێشتر لە ژێریدا ڕاوەستابووم، ئەو حەشامەتە خەڵکە بوو، کە چواردەوریان دابووم و چاوەڕێی شتێکیان دەکرد.

پاش ئەوەی بێهوودە بوون و هیوایان بەکاریگەری بارانەکە نەما!؟

هێدی هێدی چواردەوریان چۆڵ کردم و جێیان هێشتم...

هەرچەندە هیچ لە شوێنی خۆم نەبزوام، بەڵام نازانم بۆ وا هەستم دەکرد کە ڕەنگە لە نێو واگۆنی ژمارە حەوتی شەمەندەفەرەکەدا بم و لە جامەکەیەوە بڕوانمە، وێنەی نەگۆڕاوی بیابانەکە.

# بەسەرهاتی سەگێک لە سێبەرەکەیدا

١

بەدرێژاییی ئەو چەند ساڵەی کە وەک پەناهەندەیەک لە شاری شۆلۆ-ی کەنار دەریادا دەژیام، نەمویستبوو بچمە نێو ئەو گەڕەکە دێرینەی کە بەگەڕەکی ئینگلیزەکان ناسرابوو. سەیریش لەوەدا بوو نە ئینگلیزەکان هیچ پێوەندییەکیان بەدروستکردنی ئەو گەڕەکەوە هەبوو، نە بەدرێژاییی مێژووی ئەو گەڕەکەش کەسێکی بەڕەچەڵەک ئینگلیز لەو گەڕەکەدا ژیا بوو. بەو پێیەی کە لە تەنها کتێبێکی تایبەت بەو گەڕەکەشەوە باسی لێوە کرابوو؛ تا ئێستا کەس لەوە حاڵی نەبووە کە بۆ دەبێت ئەو ناوەیان لەو گەڕەکە نابێت. ئەمە جگە لەوەی کە نەدەزانراش کێیە ئەو کەسەی کە بۆ یەکەم جار ئەو ناوەی لەو گەڕەکە ناوە.

دەماودەمیش شتی سەیروسەمەرەیان لە بارەی ئەو گەڕەکەوە دەگێڕایەوە و وەک باس دەکرا باران پێش ئەوەی لە هیچ شوێن و

جێگەیەکی شاری شۆلۆ-دا ببارێت، لەوێ دەبارێت. بارەش تەنها لە نێو کۆلانەکانی ئەو گەڕەکەدا دەنگی هەیە و گڤەی دێت. پشیلە و سەگی بەرەڵلا تەنها لەو گەڕەکەدا بەرچاو دەکەوێت.

هەموو ئەوانەی کە بەگەڕەکەکەدا گوزەریان کردبوو، سەرسامی گومەز و قەیسەری و کۆلانی تەسک و ترووسک و چوخم و حەمام و زۆر سیمای ڕۆژهەلاتییانەی تری ببوون. سەرباری ئەوەی کە خەڵکێکی تێکەڵ و پێکەڵی جۆراوجۆر لەوێدا دەژیان: هەر لە ماسیگر و دز و گەواد و فاحیشە و ئەو هونەرمەندە توریستە غەیرە ئینگلیزانەی کە لەبەر هەر هۆ و هۆکارێک بێت ئەو گەڕەکەیان دەکردە مەنزڵ.

دیارە گەر هەر لە سەرەتای گەیشتنم بۆ نێو شاری شۆلۆ ئەو پیرە پیاوە هیندییەم نەدیتبا و نەمهێشتبا لە هێلە تێکەڵ و پێکەڵەکانی نێولەپی دەستم ورد بێتەوە و ڕێم پێ نەدابا زارە کەف گرتووەکەی لێک بترازێنێت و ئەوەی کە پێی گوتم نەیگوتبا، ئەوە دەمێک بوو ئەو گەڕەکەم دیتبوو.

هەرکە بینیمی وەدووم کەوت، سەرەتا وامزانی دەرۆزەکەرە و لەوە دابوو دەست بخەمە گیرفانم و شتێک پارەی بدەمێ. دەستی گرتم و لە پەیکەری کابرایەکی حەپەساو کە لە هیچی نەدەڕوانی، دەیان کۆتر بەدەوری پەیکەرەکەدا ئەو دەنکە گەنمانەیان کۆ دەکردەوە کە پیرێژنێک تۆزە تۆزە بۆی ڕۆ دەکردن. پیرە پیاوە پرچ درێژەکە سەرەتا تەنها لە لەپی دەستێکمی دەڕوانی، دوات ئەوی تریان و جارێکی تر ئەمیان و ئیتر بەو شێوەیە بەردەوام بوو تا لەبڕ نیگاکانی بەتەواوی لەسەر هێڵێکی چەماوەی نێولەپی یەکێک لە دەستەکانم گیرسایەوە و ئەوەندە

بەعاجبایەتییەوە تێی دەڕوانی هێندەی نەمابوو بۆ خۆشم وێنە و پیت و لوغزی تێدا ببینمەوە. بەچەشنێک خۆی شپرزە کردبوو دەتگوت دەعبایەکی پیاوخۆر وەدووی کەوتووە و ئەمیش لە ترساندا چۆتە نێو کۆلانێکی داخراو و ئیدی نازانێت خۆی بەکوێدا بکات و لە کوێوە هەڵبێت. زارە کەفکرتوومکەی بەش کردەوە و بەزمانی عەرەبی گوتی:

(تۆ بێجگە لە ناوی خۆت هەموو شتێکت لە یاد چۆتەوە. ئەگەر دەتەوێت بەئارامی و ئاسوودەیی بژیت بەهیچ شێوەیەک مەچۆرە نێو گەڕەکی دێرینی ئینگلیزەکان؛ تا یادەوەرییەکان بەزمینتدا ختوورە نەکەن، تۆ لە ئێستادا بێجگە لە ناوێک هیچی تر نیت و نابێت لەوە زیاتریش بیت، تەنها شتێکیش کە دەبێتە مایەی وەبیرکەوتنەوەی هەموو ئەو شتانەی کە لە زمینتدا سڕدراوەتەوە ئەو گەڕەکە دێرینەیە).

ئەوەی کە لەو کاتەدا بووە مایەی پرسیار و بەدرێژاییی ڕۆژانێکیش هەر بیرم لێ دەکردەوە، ئەوە بوو کە بۆ دەبێت پیرە پیاوەکە بەعەرەبی ئەو قسانەی پێ گوتبێتم.

ڕاستییەکەی هیچ پێوەندییەکەم لە نێوان گەڕەکی ئینگلیزەکان و هەموو ئەو شتانەی کە لە بیرم کردبوو نەدەدۆزییەوە. ئەمە جگە لەوەی دوای سێ ساڵی مانەوەم لە نێو نەخۆشخانەی دەروونی ئەو شارەی کە جێم هێشتبوو، گەیشتبوومە ئەو یەقینەی کە هەموو ئەو شتانەی بەدرێژاییی ساڵانێک لە مێشکمدا جێی خۆی کردبۆوە، سڕدرابوونەوە؛ چونکە ئەگەر دکتۆرەکەم بەر لەوەی لە نەخۆشخانەکە مەرەخەسم بکات، هەندێ، شتی پێ نەگوتبام ئەستەم بوو لەو کاتەدا وەبیرم کەوتبایەتەوە و زانیبام:

(باش چەند مانگێکی مانەوەت لە نەخۆشخانەکەماندا هەواڵی

مەرگی دایکتمان پێ گەیشت، هەر لەو ڕۆژەوە کە تۆیان هێنایە نێو نەخۆشخانەکە ئەو مردبوو. بەڵام پاش چەند مانگێک و بەڕێکەوت کەسێکی نەناسراو ئەو ڕاستییەی کەشف کردبوو کە بەمەبەستێک چووبووە نێو خانووەکەتان و بەبۆنی جەستەی گەنیوو و هەڵوەشاوەی دایکت وڕ و کاس ببوو، بەپەلە چووبووە دەر و دەرکەی یەکێک لە ماڵە دراوسێیەکانتانی لێدابوو، چاوەڕێی ئەوەی نەکردبوو دەرکەکەی لێ بکەنەوە، هەرکە گوێی لە نزیکبوونەوەی دەنگی پێی کەسێکی پشت دەرگاکە ببوو گوتبووی:

«پیرێژنێک لە نێو خانووی نێوەڕاستی باخچە گەورەکەدا مردووە» تا کەسەکەی پشت دەرگاکەی کردبۆوە هەروەک ئەوەی کە غەیب بێت؛ لە دووری سەد مەتریشەوە کەسی بەدی نەکردبوو.

هەرکە لێرە چوویتە دەرێ خۆت ماتەڵ مەکە و یەکسەر خانوومکەت بفرۆشە و بەپارەکەی بۆ دوورترین پانتاییەکی جوگرافی دنیا بڕۆ، تا هیچ شتێک ئەم شارەت وەبیر نەخاتەوە. تەنها ئەوەندەش لە بارەی خۆتەوە بزانە کە تۆ پاش خوێندنەوەی کتێبی - گۆرانیبێژە دەنگخۆشەکانی شار - باری دەروونیت گۆڕانی بەسەردا هات و تێکچوویت. هەرچەندە کتێبێکی ئاسیاییە و باس لە هەموو گۆرانیبێژە دەنگخۆشە مردووەکانی شار دەکات؛ کە هێشتاکەش هەر دەتوانن لە نێو گۆڕەکانیانەوە و لە شەوە زۆر تاریکەکاندا گۆرانی بچڕن. ڕەنگە هۆکاری تێکچوونی باری دەروونیشتان لە بێ باوەڕیتانەوە سەرچاوەی گرتبێت، ڕەنگە پێتان وا نەبێت کە گۆرانیبێژە دەنگخۆشەکانی ئێمە لە دوای مەرگیش دەتوانن گۆرانی بڵێن. بەڵام من بۆ خۆم هەر بۆ تاقیکردنەوەی ڕاستی و دروستی

ئەوەی کە لەو کتێبەدا هاتووە، لە شەوێکی زۆر تاریکدا چوومە زیارەتی گۆڕەکانیان و پاش کەمێک لە مانەوەم سەرسام بووم بەو دەنگە جۆراوجۆرە سیحراوییەی کە یەک لە دوای یەک لە گۆڕەکانیانەوە دەهاتە دەرێ).

گەرچی دەبوو پاش فرۆشتنی ئەو خانووەی کە بەمیراتی بۆم مابۆوە یەکسەر ڕۆیشتبام. بەڵام خولیای زانینی نهێنی ئەو کتێبە وای لێ کردم یەک دوو هەفتە بمێنمەوە و عەودالّی ئەوە بم کە وەچنگم کەوێت و بیخوێنمەوە. بێجگە لەوەی هەموو ئەرشیفی لیستی ناوی کتێبی کتێبخانەکانم هەڵدایەوە و زۆر بەوردی بەشوێنیدا گەڕام، کتێبفرۆشی نێو شار نەما ڕاینەسپێرم تا ئەو کتێبەم بۆ پەیدا بکات. دیارە هەمووشیان بەداواکارییەکەم سەرسام دەبوون و تەنانەت زۆریشیان وایان دەزانی پێیان ڕادەبوێرم و هەمووشیان تەنها یەک وەڵامیان دەدامەوە:

(بەدرێژاییی مێژووی ئەم شارە نەک هەر دەنگخۆشێکی تێدا هەڵنەکەوتووە بەڵکو گۆرانیبێژیشی تێدا نەبووە و نەشمان بیستووە کەسێکی خەڵکی ئەم شارە گۆرانی گوتبێت).

٢

ئەوەی کە وای لێ کردم لە عەسری یەکێک لە ڕۆژە باراناوییەکاندا ڕوو بکەمە نێو کۆڵانێکی ئەو گەڕەکە دێرینە، نووسراوێکی سەر لافیتەیەکی ڕەنگ پەمەیی بوو. هەر لە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا دوو کچۆڵەی چاوسەوزی باڵابەرز بەرانبەر ئەو دوکانەی کە کارم تێدا دەکرد هەڵیانواسی کە لەسەری نووسرابوو:

(لەمڕۆدا دەیان تابلۆی دێرینی سەیروسەمەرەترین هونەرمەندە شێوەکارەکانی دنیا لە یەکێک لە کۆڵانەکانی نێو گەڕەکی ئینگلیزەکاندا دەفرۆشرێت).

هێندەم ڕوانییە لافیتەکە خاوەنی ئەو دوکانەی کارم تێدا دەکرد کە ژنێکی ئەرمەنی بوو، دەمێک ساڵیش بوو ئەو دوکانی تەیروتوو فرۆشتنەی لە شوێنێکی لاچەپەکی شاری سۆلۆ -دا کڕیبوو، بەدەنگێکی هێمن و لەسەرەخۆ بانگی کردم و بەئینگلیزییەکی شێوە جیاواز لە ڕیتمی ئینگلیزی گوتی:

(هەرچەندە هێشتاکە زووە، بەڵام دەتوانیت هەر ئێستاکە بڕۆیت ئەگەر چاوەڕێش دەکەیت ئەوە وەک هەموو ڕۆژێک لە سەعات دوودا کارت تەواو دەبێت).

ئیدی چونکە زۆر کەم دەیدواندم و بەدرێژایی ئەو ماوەیەش کە لای دەستبەکار ببووم، بێجگە لە وشە فەرمانئامێزەکانی کە دەبوو بێ هیچ وەڵام و خۆ ماتەڵکردنێک دەستبەجێ بەئەنجامی بگەیەنم و هەمووشی پەیوەست بوو بەچۆنیەتی مامەڵەکردنم لەگەڵ ئەو مەلە دەگمەنانەی کە پێشتر لە هیچ شوێنێکی تردا نەمدیتبوو، گوێم لە هیچ شتێکی تری نەببوو.

هەر بۆیە ئەوەی کە پێی گوتم هێندە سەیر بوو بەلامەوە کە بەدەر لە دەسەڵات و ئیرادەی خۆم، هەموو ئەوەی لە بیر بردمەوە کە پیاوە هیندییەکە پێی گوتبووم.

هەر لە عەسری ئەو ڕۆژەشدا بەبێ هیچ گرفتێک و هەروەک کەسێکی بەڵەد و شارەزا شوێنێکی نێو گەڕەکەکەدا ڕەت ببم گەیشتمە نێو کۆڵانەکە، بەڵام هێشتاکە هیچ تابلۆیەکی تێدا

دانەنرابوو، ئیدی بۆ ساتەوەختێک دوودڵ بووم لەوەی کە تۆ بڵێی ئەمە ئەو کۆڵانە بێت کە دەبا تابلۆکانی تێدا فرۆشرابا!؟

خەریک بوو لە دەرگای کراوەی یەکێک لە ماڵەکانی نێو کۆڵانەکە بچمە ژوورێ تا کەسێک ببینمەوە و پرسیاری لێ بکەم. بەڵام وەک ئەوەی لە ناکاو سەرابێک ببینم، کاتێکم زانی لە بەشی سەرەوەی کۆڵانەکەدا چەندان کەس دەڕواننە تابلۆ هەڵپەسێراوەکانی هەردوو بەری دیواری نێو کۆڵانەکە، ڕووناکییەکی نائاسایی لەوێرا دەهات، بێجگە لە من هەموو ئەوانی لەوێدا بوون پرچ و ڕدێنیان درێژ بوو، چاویان نووری لێ دەباری، قامکەکانیان درێژ و باڵا کەڵەگەت بوون، وەک ئەوەی ڕۆژێکی زۆر سارد بێت کە دەدوان هاڵاو لە دەمیان دەهاتە دەرێ، کە لێیان نزیک بوومەوە هەستم بەوە کرد کە دەنگیان لێوە نایەت و تەنها لێویان دەبزوێت، پێ دەچوو بەقەبارە و چەشن و شێوەی ئەو هاڵاوەی کە لە زاریان ڕا دەهاتە دەرێ، لە هەموو ئەوە حاڵی بن کە بەیتا بەیەکدییان دەگوت. نەمدەزانی بۆ دەبێت لە ژێر باراندا و لەم کۆڵانەدا ئەم بازاڕەیان ساز دابێت، پێشم وا نەبوو مشتومڕەکەیان دەرحەق بەتابلۆکان بێت چونکە نە دەیانڕوانییە تابلۆکان و نە لێشی نزیک دەبوونەوە؛ هەروەک ئەوەی لە پانتاییەکانی شوێن و زەمەنێکی تردا ڕاوەستابێتن.

پاش ئەوەی سەرپێیی سەیری چەند تابلۆیەکم کرد کە هەر هەمووی دیمەنی شەپۆلە هەڵکشاوەکانی یەک دەریا بوون، هەر لە خۆمەوە چوومە بەردەم گچکە تابلۆیەک کە سەرەتا بێجگە لە چەند ڕەنگێکی تێکەڵ و پێکەڵ هیچی ترم تێدا نەبینی. بەڵام پاش کەمێک تێڕامان، هێدی هێدی وێنەکە لە بەرچاومدا ڕوون بۆوە سەرسامی کردم.

دەتگوت ڕایەڵێکی نهێنی و پەنهان، من و وێنەی تابلۆکە پێکەوە گرێ دەدات: هەرچەندە تا ئەو ساتەوەختەش هیچ یادەوەرییەکی خۆمم وەبیر نەهاتبۆوە، بەڵام پێ دەچوو من لە شوێنێکی ئەو تابلۆیەدا بم، یان ئەو لە شوێنێکی یادەوەرییە سڕدراوەکانی مندا شوێن جێگەیەکی هەبووبێت.

هونەرمەندە شێوەکارەکە هەوڵی بەوێنەکردنی سەگێکی شەکەت و ماندووی دابوو، بەڵام پێ دەچوو بەمەبەستێک وێنەی سەگە ڕاستەقینەکە و سێبەرەکەی تێکەڵ کردبێت، کە لێی ورد دەبوویتەوە پێت وابوو بەقوڕاوی کۆڵانە ڕۆژهەڵاتییەکان ڕەنگ کراوە، بێجگە لە چاوە شینەکانی کە دەچۆوە سەر سولاڵەی سەگە سیبریاییەکان سەرتاپای قوڕاویی بوو. لە هەمووشی سەیرتر ئەو پەڵە ژەنگاوییەی سەر جەستەی بوو کە بەپێی هەڵکشانی زەمەن شوێن جێگەی دەگۆڕدرا.

٢

تابلۆکە بەو مەرکانە ئاوە دەچوو کە لە ڕۆژگارێکی زۆر دێریندا کچۆڵەیەک بەبێ گوێدانە قسەی باوانی و بەئەنقەست ڕۆی کردبووە نێو ئەو بیرە وشکەوە بۆوەی کە سالانێک بوو دەیان عیفریتی تێدا نێژرا بوو، هێندەش بەس بوو بۆ زیندووبوونەوەی عیفریتە مردووەکان.

لە بەردەم تابلۆکەدا تێکەڵە و پێکەڵەی چەندەها یادەوەریم وەبیر دەهاتەوە. پێ دەچوو وەک پیرەمێردی ئەوانگەلەکان مەبەستی بێت سواری کۆڵم بێت و دەربازبوونم بکاتە مەحاڵ. تازە ئەگەر لەوێش هەڵهاتبام دەیان دەرکە لە نێوەوەی زەینمدا ئاوەڵا ببوون.

سەبارەت بەکتێبی گۆرانیبێژە دەنگخۆشەکانی شار دوا گوتەی دکتۆرەکەم بیر کەوتەوە، چەندم لە خۆم کرد ئەو کتێبەم وەبیر نەدەهاتەوە کە بەپێی قسەکانی ئەو ببووە مایەی تێکچوونم. نەدەکرا کتێبێکی وا سەبارەت بەگۆرانیبێژەکانی شارێک نووسرابێت، کە نەک هەر بەدرێژایی مێژووی چەند سەد ساڵەی گۆرانیبێژێکی تێدا هەڵنەکەوتبوو، بەڵکو سەرجەم خەڵکەکەشی هەر بەزگماک دەنگیان ناخۆش بوو. ڕیتمی ناقۆڵابوونی دەنگیشیان بەپێی وەرزەکانی ساڵ دەگۆڕدرا، گەرچی بەشێوەیەکی گشتی دەنگیان بەدەنگی بەربوونەوەی جامە مسێکی دەست کەیبانوویەک دەچوو بەتایبەت ئەو کاتەی بەر عەردێکی کاشیکراو دەکەوێت. خەڵکەکە لە نێو خۆیاندا کە پێکەوە دەدوان نەشازێکیان لە دەنگی یەکتردا نەدەبینییەوە، بەڵام کە دەچوونە دەرەوەی سنوورەکانی شارەکەیان و گوێیان لە دەنگی خەڵکانی تر دەبوو بەخۆیاندا دەشکانەوە و مەگەر زۆر بەناچاری چەند وشەیەکیان لە دەم هاتبایاتە دەر ئەگینا هەروەک ئەوەی کە لاڵ بن تەنها بەئاماژە و جووڵە جووڵ و سەر لەقاندن، گوزارشتیان لەوە دەکرد کە دەیانویست بیڵێن.

بەڵام منداڵان دەنگیان وەک دەنگی هەر منداڵێکی ئاسایی بوو، ئەو گۆڕانە لە هەرزەکارییەوە ڕووی دەدا و تا مردن لە خەڵکی شارەکە نەدەبۆوە.

وەک لەو ساتەوەختەدا وەبیرم دەهاتەوە داپیرەم چەند جارێک هۆکاری ئەو دەنگ ناخۆشبوونەی خەڵکی شاری لە میانی حیکایەتێکەوە بۆ گێڕابوومەوە هەرچەندە ئەو دەمەی کە هێشتاکە توانای گێڕانەوەی حیکایەتی هەبوو، من زۆر منداڵ بووم و بەو پێیەش

نەدەبا لە حیکایەتەکەی حاڵی ببام، جا چ جای لە بیرنەچوونەوەی. هەر ئەو حیکایەتەش بوو کە پاش مردنی داپیرەم، بەقەڵەمێکی سوور لەسەر کارتۆنێکی زەرد و بەخەتێکی جوان نووسیمەوە و لە پاڵ کارتۆنە هەڵواسراوەکانی تری دیواری پشتەوەی ژوورەکەی بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان هەڵمواسی، ئیدی ئەو کارەم بەڕێوەبەری زۆر تووڕە کرد و هێندەی لێدام تا لە هۆش خۆم چووم. بەڵام نە ئەو کاتە و نە ئێستاش لەوە حاڵی نەبووم، بۆ دەبێت نووسینەوە و هەڵواسینی ئەو حیکایەتە ئاساییەی کە هەموو خەڵک دەیزانی هێندە بەڕێوەبەری تووڕە کردبێت، کە لە کاتێکدا هەموو خەڵک دەیزانی هێندە بەڕێوەبەری تووڕە کردبێت، لە کاتێکدا هەموو ئەو قوتابیانەی کە حیکایەتیان دەزانی بێ پرسکردن لەسەر پارچە کارتۆنێک دەیاننووسییەوە و هەڵیاندەواسی چونکە بەڕێوەبەر هەر بۆ خۆی چەند جارێک داوای لێ کردبووین کە هەر حیکایەت و بەسەرهاتێک کە بەخەیاڵماندا دێت یان پێشتر بیستوومانە و دەیزانین، بینووسینەوە و هەڵی بواسین.

لەو کاتەدا کە لە بەردەم تابلۆکەدا ڕاوەستابووم، دەنگی داپیرەم دەهاتە گوێ کە دەیگوت:

(لە ڕۆژگارێکدا پیرەنسوور بەمەبەستی سەردانی زاتێکی موبارەکی ئەو سەردەمە باخچە فراوانەکەی خۆی جێ دەهێڵێت کە دەکەوتە نێوەندی گەڕەکی مەلەکای ئێستاوە. پاش چەند هەفتەیەک دەگەڕێتەوە و پێش ئەوەی بچێتە نێو باخچە دڵگیرەکەی هەر بەسەر سیمای خەڵکی گەڕەکەکەدا دەزانێت شتێک ڕووی داوە، بەشپرزەییەوە دەپرسێت: «چییە.. چی ڕووی داوە؟!»

کچۆلەیەکی جحێڵ پاش ئەوەی دەستی پیر ماچ دەکات، دەڵێت: «قوربان گەرچی بێ پسانەوە و بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە جەنابتان لە سەفەر بوون کوڕێژگەکانی گەڕەکەکەمان بێ پشوودان و وچان پاسی باخچەکەتانیان کردووە، بەڵام پێ دەچێت لە غەیبەوە کەسێک هاتبێتە نێو باخچەکە و سەرجەم گەڵاکانی درەختە پیرۆزەکەی وەراندبێ».

پیر دەزانێت ئیدی ئەو درەختە گەڵا دەرناکاتەوە و لە بنڕا وشک دەبێت و دەمرێت، چونکە هەوەڵین و دواهەمین گەڵای هەر ئەوە بووە کە پێش ئەم حاڵەی ئێستا پێوەی بووە، سەرباری ئەوەی ئەگەر لە غەیبەوە دەستێک بگاتە ئەو درەختە، ئیدی دەرکەی بەڵا و موسیبەتێکی گەورەیان لێ والا دەبێت.

پیرمەنسوور لە حەژمەتا نازانێت چی بکات و دەڵێت:

«ئێستا چی بکەم، دەترسم لەمەودوا تۆفان و لافاو بتانبات، کچانتان دەربێ داکەنن بکەنە هونەر و پیاوانی بێگانە سواری خۆیان بکەن، ژنانتان ڕەدوو بکەون، گەورە پیاوانی شارتان فێرە خیانەت بین و هەر دەمەی چەشنە داگیرکەرێک بهێننە نێو شارەکەتانەوە، پیاوچاکانتان پشتاوپشت سواری گوێدرێژ بکرێن و کۆڵان بەکۆڵان بگێڕدرێن و خۆڵ و دۆ بەسەریاندا بکرێت».

ئیدی گریانی پیرەژنان و پاڕانەوەی ڕیش سپییان و هات و هاوار و فوغانی بێ خەتایان، وا لە پیرمەنسوور دەکات بڵێت:

«تەنها یەک چارەتان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە بۆ خۆتان دەرد و بەڵا و موسیبەتێک هەڵبژێرن، تا هەموو ئەوەی کە گوتم پێکەوە ڕوو نەدەن».

پاش مشتومڕ و بگرە و بەردەیەکی زۆر لەسەر بێ زیانترین دەردێک

ڕێک دەکەون کە ئەویش ناسازبوون و ناخۆشبوونی دەنگیانە.

هەر بۆیە پیرەمەنسوور فەقیانە سپییەکانی بەردەداتەوە و دەستەکانی ڕووەو ئاسمان بەرز دەکاتەوە و بەدەنگێکی پڕ لە پاڕانەوە و ترسەوە دەڵێت:

«ئەی شاهی شاهان، سوڵتانی سەر عەرشی کەون و کائینات».

وەک دەگێڕنەوە پیر لەوە زیاتر ناڵێت و ئاورێک لە حەشامەتەکەی پشت خۆی دەداتەوە و بەبێ ئەوەی تەنها یەک وشەشی لە دەم بێتە دەر، خەڵکەکە لە مەبەستی حاڵی دەبن و سەرەتا یەک دوویەکیان لە مابەینی خۆیاندا دەدوێن، پاشان ئەوانەی تر دەبینن دەنگیان بۆتە شتێکی هێجگار ناخۆش و لەو کاتەدا هەر هەموویان پێکەوە بێدەنگ دەبن.

٤

نەمدەزانی بۆ دەبێت وا بەسانایی بڕوانمە ئەو تابلۆیەی کە تا دەهات زیاتر بەرەو خۆی ڕایدەکێشام و نغرۆی نێو دنیایەک لە یادەوەری دەکردم، کە دەبوو بەهیچ وەبیرم نەهاتبایەتەوە. ڕەنگە هۆکارەکەی ئەو پێوەندییە دێرینەم بێت لەگەڵ دنیای تابلۆ و ڕەنگ و شێوەکاری کە لە میانی خۆشویستنی ژینا-ی کچە دراوسێمانەوە ببووە بەشێکی جیانەکراوەی خەون و خولیاکانم.

ئەو دەمەی لە بەشی شێوەکاری هونەرە جوانەکان قوتابی بوو، شێتانە وێنەی هەموو شتێکی بەو شێوەیە دەکێشا کە خۆی دەیبینی. هێندەی دەرفەتمان بۆ دەڕەخسا لە دەروازەیەکی مابەینی خانووەکانمانەوە: پاش ئەوەی بەنێو باخچە چڕوپڕەکەماندا تێپەڕ

دەبوو، دەهاتە نێو ئەو ژوورەی کە بێجگە لە دەیان کتێبی لەسەر عەرد کەڵەکە بوو، مێز و کورسییەک و سیسەمێکی خەوتن و تابلۆکانی ئەو کە بەزۆر شوێنی دیوارەکەدا هەڵمواسیبوون هیچی تری تێدا نەبوو.

وەک خۆم تاقانەی دایکێکی بێوەژن بووم، کە دوای هەفتەیەک لە مەرگی باوکم؛ دایکم لەسەر چەرپا بەرزەکەی ژووری خۆیان ڕاکشا و ئیدی پاش چەند سەعاتێک بەوەم زانی کە دەست و قاچێکی لە کار کەوتووە و ئیفلیج بووە.

ژیانم لە مابەینی خزمەتکردنی دایکێکی ئیفلیج و خوێندنەوە و ماجەراکانم لەگەڵ ژینا-دا؛ بەبازنەیەکی داخراو دەچوو کە نەمدەتوانی و نەمدەویست لێی بچمە دەر. باوکی شۆفێری تریلە بارهەڵگرەکانی ڕێگەی دوور بوو، کە بەمانگیش ڕێی نەدەکەوتە ماڵێ و کە دەهاتیشەوە تەنها چەند ڕۆژێک دەمایەوە و وەک هەمیشە ڕێگەی دووری سەفەری دەگرتەوە بەر.

وەک بۆی دەگێڕامەوە دایکی لەگەڵ کابرایەکی زرتەبۆزی میسریدا دەستی تێکەڵ کردووە، کە زوو زوو بەناوی چاککردنەوەی ئامێرە کارەباییەکانیان دێتە ماڵیان.

لە ڕۆژێکدا بەبۆنەی ساڵڕۆژی یەکێک لە یادەوەرییەکانی حیزبی بەعسەوە، ئاهەنگێک لە گۆڕەپانی پەیمانگای هونەرە جوانەکاندا ساز دەکرێت و بەفەرمانی بەڕێوەبەری پەیمانگا و لێژنەی ئیداری، سەرجەم قوتابیان لە گۆڕەپانەکەدا کۆ دەبنەوە.

پاش وتارێکی دوورودرێژی بەڕێوەبەر و پێداهەڵدانێکی ئێکسترای بەحیزبی بەعسدا، وەک هەمیشە مامۆستا کەمانچەژەنە ناودارەکە دێتە بەردەم مایکرۆفۆنەکە و پاش کورتە مەدح و سەنایەکی

سەیدولرەئیس و حیزبەکەی: بەجۆش و خرۆشەوە ئاوازی گۆرانی زێڕە دەژەنێت، چەند گۆرانیبێژێکیش کە لە شارێکی ترەوە هێناویانن، لە دوویەوە دەنگی لێ بەرز دەکەنەوە.

لەو کاتەدا بایەکی نەیار هەڵدەکات و قژە ماش و برنجییەکەی مامۆستای کەمانچەژەن دەژاکێنێت و لاپەڕەکانی بەردەمی کە لەسەر ستاندێک ڕاگیر کراوە بەحەوادا دەبات. لەم کەین و بەینەدا ژینا خۆی دەدزێتەوە و دەگەڕێتەوە ماڵێ، بەدەنگی هەموو ئەو بڵندگۆیانەی کە بەیتا بەیتا گۆرانی زێڕە و پۆلاڕێز دووبارە دەکەنەوە و لە هەموو سووچ و پەنایەکی کۆڵانەکانەوە دەنگیان دێت، وڕ و کاس دەبێت و لە نێو ئەو ژاوە ژاوەدا هەموو دەرگا داخراوەکانی ماڵەویان دەکاتەوە و تا ژووری خەوتنی دایک و باوکی ڕاناوەستێت، کابرا میسرییەکە بەڕووت و قووتی بەسەر دایکییەوە دەبینێت کە لە گەرمەی تەکاندانداییە، ئاخ و ئۆف و وەیش وەیشی ئالۆشاوییانەی دایکیشی لە نێو دەنگ و سەدای بەرزی بڵندگۆکاندا بەحاڵ دەبیستێت.

لەو ڕۆژەدا کە هاتە لام فرمێسک بەچاوە سەوزەکانیدا دەهاتە خوارێ و پاش گێڕانەوەی چەند جارەی ئەوەی کە بینیبووی، لەپڕ بەچۆکدا هات و بەڕێتمێک کە پاڕانەوەم تێدا دەبینییەوە، داوای ئەوەی لێ کردم ئەو شتەی لەگەڵدا بکەم کە لە دایکی کراوە، زۆر جاران بەڕووتیش لە باوەشی یەکتردا خەوتبووین، بەڵام بیرمان لە شتێکی وا نەکردبۆوە. زیاتر چێژمان لە ماچ و مووچ و دەستەملانێ و تەپاوتلی نێو جێگاکە دەبینی.

هەندێ جاریش دەیکردمە مۆدێل و پاش ئەوەی ڕووتی دەکردمەوە، لەسەر تاکە کورسییەکی نێو ژوورەکەم دادەنیشت و جیا جیا سکێچی

بۆ هەر بەشێکی لەشم دەکرد، بەتایبەتیش ئەو بەشانەی کە دەماری هەڵئاوساویان تێدا بوو. لە هەمووشی سەیرتر ئەو چەند سکێچە بوو کە بۆ ئەندامی نێرینەمی کردبوو، بەچەشنێک شێواندبووی کە بۆ خۆشم باوەڕم نەدەکرد کە ئەوە ئەو بێت، مەگەر بەدرێژی و زلییەکەیدا ناسیبایەتمەوە. هێندەی نەبرد دوگمەی کراسەکەی ترازاند، سوتیانەکەی زۆر بەهێمنی لە دواوەڕا کردەوە، مەمکەکانیم لە چاو جارەکانی تردا کەمێک گەورەتر هاتە پێش چاو کە هێشتا کە شوێن مۆربوونەوەی ماچ و مژینی جاری پێشوومی پێوە دیاربوو. دواتر زریزەی تەنوورە کورتەکەی بەری کردەوە و پاش کەمێک دمڕێ گوڵ گوڵینە تەنکە پەمەییەکەی هێنایە خوارێ و بەپەلە هاتە ژێر ئەو پەتۆ تەنکە ڕەنگ قرمزییەی کە لە ژێریدا ڕاکشابووم. نەمدەزانی بۆ لە ئێستادا ئەوەم وە بیر نایەتەوە کە ئاخۆ ئەوەی بۆ خۆی لێی داوا کردم، کردم یا نا!؟

٥

درەخت و گوڵ و ڕووەکە سەیر و عەجایبەکانی نێو باخچەکەی چواردەوری خانووەکەمان، باوکم پێش مردنی لە دوورترین سەفەرێکی کە گەڕایەوە لەگەڵ خۆی هێنابوونی.

سەرەتا هەموو ئەوانەی کە باوکمیان دەناسی قەناعەتیان بەوە نەبوو هیچ کام لە نەمامی ئەو درەختە سەیرانە لە گڵە سووردا ڕەگ دابکوتن و سەوز ببن، ئەمە بێجگە لەوەی کە سوێندیان بۆ دەخوارد و دەیانگوت؛ (مادامەکی ئەمانە هەموویان دار و درەختی وڵاتی گەرمن، مەحاڵە لە بەردەم ساردوسڕی زستانی ئەم شارە و ڕەشەباکەیدا خۆیان بگرن).

ئیدی موعجیزەکە لەوەدا بوو، ئەو درەختانەی کە ساڵێک بوو ڕوێنرابوون و سەوز نەبووبوون، پاش مەرگی باوکم و لەو پایزەدا هەر لە خۆیانەوە گەڵایان کرد. تەنانەت دوای ئەوەش بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر گەشەیان کرد و هێندەیان لق و پۆپ دەرکرد و پەل و پۆیان هاویشت، هەموو ڕێگەیەکی هاتنە ناوەوەی خۆرەتاویان بۆ نێو ماڵەکەمان بڕی و کردیانە کڵێسەیەکی شێداری نێو حیکایەتەکان.

ئەمە بێجگە لەوەی کە ڕووەکە بەچنگە سەرسەختەکان هەموو دیوار و سەربان و هەورەبان و سووچ و پەنایەکی ماڵەکەیان تەنیبوو. ئیدی دنیایەکی جودا و جیاوازی لە هەموو ئەو دار و درەخت و ڕووەکە سەیروسەمەرانە دروست ببوو.

شەوگەردی قەبارە گەورەی نائاسایی لە نێو ڕووەکە بەچنگەکاندا خۆیان مەڵاس دەدا. مێش و مێشووله و هەموو چەشنە مێرووەکانی تریش سەر بەدنیای نێو درەختانی شار نەبوون، پێ دەچوو لەگەڵ ئەمامی درەختەکانی باوکم لەو کیشوەرە دوورەوە هاتبێتن.

هەر کاتێک کە ژینا دەهاتە لام سەرەتا بۆنی گوڵە سوورەکانی ئەو ڕووەکە هەمیشە سەوزەی دەکرد کە هەردەم بەدەر لە کاریگەری کەشوهەوا و وەرزەکان ژمارەیەکی نەگۆڕ لە گوڵ و خونچەی پێوە بوو.

هەرکە پڕ سییەکانی بۆنی بەگوڵەکانەوە دەکرد مەست و گێژ دەبوو، ماوەیەک بەچیچکانەوە بۆی دادەنیشت و نەیدەوێرا هەڵسێتە سەرپێ نەبادا لاقەکانی تێک بئاڵێن و بکەوێت.

زەمەن لە ژێر ئەو هەموو دار و درەختەدا بەزەمەنی ئاسایی نەدەچوو، زۆر بەهێواشی دەچووە پێش و لەوێدا هەموو شتێکت لە بیر دەکرد و بەڕاستی پێت وابوو لە کیشوەرێکی تردا دەژیت و دەنگ و

سەدای دنیایەکی ترت دەهاتە گوێ، چاوت لە ڕەنگ و تارماییەکانی پانتاییەکی جوگرافی تر دەبوو.

هەر بۆیە من و ئەو لە ژێر قورسایی سێبەری ئەو هەموو درەختەدا دەبووینە دوو بوونەوەری تر، دوو بوونەوەری ڕەنگ و شێوە جیاواز، ڕەنگە لە دەرەوەی ئەو پانتاییەدا هەردووکمان دوو مەخلوقی تر بووینایە، بۆنێکی جیاوازترمان لێ بهاتایە لە کاتێکدا لەوێدا بۆنمان بەبۆنی هەموو شتێکی نێو ئەو باخچەیە دەچوو، کە زۆر جار دەگەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە ڕەنگە لە ڕاستیدا نەبێت و تەنها خەیاڵ تەسەوری هەردووکمان چێی کردبێت.

لەوێدا شێتانە حەزمان لە یەکتر دەکرد، شێتانە لە یەکترمان دەڕوانی، شێتانە بیرمان لە دەنگی ناقۆڵای خۆمان و هەموو ئەو خەڵکە نەفرەتلێکراوەی ئەو شارە دەکردەوە.

٦

هێشتاکە لە تابلۆکەم دەڕوانی و چاوم بۆ یەکێک دەگێڕا کە لەو نزیکانەوە وەستابێت و شتێکی لێ بپرسم. هەر چییەکەم کرد زاتی ئەوەم نەکرد لە هیچ کامێک لەوانە نزیک ببمەوە کە تەنها بەهاڵاوی دەمیان لە یەکتر حاڵی دەبوون.

نوشتامەوە و لەوەدا بوو دەستی بدەمێ، کاتێکم زانی قاچ و قولێکی سفت و سپی بێ موو لە نزیکمەوە ڕاوەستا کە سەرم هەڵبڕی سەرەتا تەنوورە ڕەشە کورتەکەی سەرنجی ڕاکێشام کە بستێک لە نێوقەدیەوە هاتبووە خوارێ، تیشۆرتە پەمەییەکەی بەری هێندە تەنک بوو گۆی مەمکە قوتە بەرەڵاکانی بەئاسانی دەبیندرا؛ بەچەشنێک کە سەرسامی

دەکردیت. ملوانکەیەکی لە هێلکە شەیتانۆکە دروستکراوی لە مل کردبوو، خاچێک لە نێوە ڕاستییەوە هاتبووە خوارێ. گەردنە بەرز و ڕووکارە ئاڵە مەیلەو زەردەکەی درەوشانەوەیەکی سیحراویانەی هەبوو. ڕەنگی چاوە سەوزە کەمێک تەڵخەکانی بەو دەریایە دەچوو کە لە ساتەوەختێکدا پەڵە هەورێک دەیەوێت شتێک ڕەنگە سەوزە بەباق و بریقەکەی تێک بدات.

نەدەکرا لەو کاتەدا ژینا-م وەبیر نەکەوێتەوە، کە بەشێوە شتێکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەو کچۆڵەیەدا فەرق نەبوو. تا ئەو ساتەوەختەش هێشتاکە یادەوەرییەکانی پاش ئەو دەمەی کە هەردووکمان لە ژێر پەتۆ قرمزییەکەدا ڕاکشابووین، وەبیر نەدەهاتەوە.

دوای ئەوەی دەستی دایە تابلۆکە و هەڵیگرت، چەند هەنگاوێک دوور کەوتەوە و لەپڕ لە شوێن خۆیدا ڕاوەستا و ئاوڕێکی لێ دامەوە و بەئاماژەیەک تێی گەیاندم کە دەبێت وەدووی بکەوم.

بارانەکە بێ کەم و زیاد هەروەک خۆی دەباری، سەرنجی پێڵاوە پانە بەرزەکانیم دا؛ لە ڕۆیشتنی و بارینی بارانەکە زۆر بەیەک دەچوون.

لەو کاتەدا خۆم وەک گۆڵە سەگێک دەهاتە پێش چاو کە دوای دێڵە سەگێک کەوتبێت، بۆنی هەموو شوێنێکی جەستەیم دەکرد لە هەمووشی خۆشتر ئەو بۆنە بوو کە لە مەمکۆلانییەوە دەهات. بۆن و نمەی باران و دەنگی پێی کەشێکی سەیریان بۆ خوڵقاندووم کە دەمێک بوو لێی بێ بەش بووم. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ دەبێت پەنجەکانم چییان لێ بەسەر بێت، ئەگەر بگەنە ژێر تیشۆرتە تەنکەکەی بەری و بەر گۆی مەمکەکانی بکەون، دەبێت لێوەکانم چەند ڕەنگ بگۆڕن ئەو دەمەی دەگەنە گەردن و ڕوومەت و لێوەکانی. سمت و کەفەڵی هێندە

تورت و هەڵئاوساو بوون، حەز و ئارەزوویەکی هەرزەکارانە بەنێو دەمارەکانمدا دەگوزەرا و دەتگوت لە دنیایەکی تردام، یان لە خەونێکی قووڵدام و شەیتان خۆی لێ کردوومەتە شیرنترین مێینە و تا شەیتانی نەبم دەستبەردارم نەبێت و ئێخەم بەرنەدات.

بەنێو باریکە کۆڵانێکی دووروودرێژی پاک و خاوێندا ڕۆیشتین و هێندەی نەبرد لە دەرکەی کراوەی خانوویەکەوە چووە ژوورێ، کە پانی حەوشەکەی پێنج مەترێک دەبوو، وەدووی کەوتم تا ئەو دەمەی دەرگایەکی تریشی کردەوە و چووە ژوورێ. لە ئاستی دەرگاکەدا قەدەرێک ڕاوەستام، بەڵام پاش ئەوەی هیچ دەنگی نەبوو بەکاوەخۆ چوومە ژوورێ و لەسەر قەنەفەیەکی پانوپۆڕی ڕەنگ قاوەیی دانیشتم کە هەر بەجێگەی خەوتن دەچوو. ژوورەکە ڕێک خراوە و پوخت بوو دەیان شتی ئەنتیکە و تابلۆی بەنرخ بەدیوارەکانییەوە هەڵواسرابوو. ئەو تابلۆیەی کە یەکسەر سەرنجی ڕاکێشام وێنەی ڕاوچییەک بوو کە بەڕمەکەی کارمامزێکی پێکابوو، بەڵام هێشتاکە لەسەر لاقان ڕاوەستابوو. بەمنداڵیش کە لەگەڵ باوکمدا چووبوومە دوکانی بلەی عەلاف، تابلۆیەکی لەو چەشنەم بەرچاو کەوتبوو بەڵام لە جێی کارمامزەکە پڵنگێک بوو لە حاڵەتی شاڵاوبردندا ڕاوچییەکە ڕمەکەی لەسەر سنگی چەقاندبوو. بۆ ڕۆژی دواییش زۆرم لە باوکم کرد تا بمباتەوە بۆ دوکانەکەی بلەی عەلاف، وام دەزانی دیمەنێکی تر دەبینم، هەر لە خۆمەوە لایەنگری پڵنگەکە بووم، دەمگوت:

(پڵنگ ئازایە؛ بەڕمێک هیچی لێ نایەت و هەر دەبێت تۆڵەی خۆی لە ڕاوچییەکە بکاتەوە و بیکوژێت).

زۆر بەوردی سەیری چەند تابلۆیەکی تری ژوورەکەم کرد و هیچم

تێدا نەبینییەوە، لە ناکاو تابلۆیەکی لێکچووی هەمان تابلۆی سێبەری سەگەکەم بینی بەڵام کە زیاتر لێی وردبوومەوە پەیکەری تێکشکاوی کەنار دەریایەکم کەوتە بەرچاو کە لە باکگراوندی نێو قووڵایی تابلۆکە بەجێ هێڵرابوو. سێبەری سەگەکەش لە سێبەری تابلۆکەی تر زیاتر پەشۆکاو و دڕدۆنگ بوو، لەوەش نەدەچوو چاوە شینەکانی تین و گوڕی تێڕوانینیان تێدا مابێت.

٧

گچکە باڵندەیەکی دەنووک بچکۆلەی مەیلەو زەرد لە دەرگاکەوە هاتە نێو ژوورەکە و پاش کەمێک باڵەفڕە لەسەر ڕوومەکێکی نێو ئینجانەیەکی سووچێکی ژوورەکە هەڵنیشت.

دوو کچ لەو دەرگایەوە هاتنە دەرێ کە پێشتر کچەکەی تری پێدا چووبووە ژوورێ. پرچ زەردەکەیان بەسەرسامییەوە سەرنجی دام و پاش هەڵوێستەکردنێکی کەمخایەن، ئاگام لێ بوو بەوەی تریانی گوت:

(خۆ نامناسێتەوە!؟)

پاش ئەوە نەمزانی چۆن لە ژوورەکە هاتمە دەرێ و وەدوویان کەوتم، هێشتاکە لە هەمان سانەوەختی عەسری ئەو ڕۆژەدا بووین و پێ دەچوو زەمەن لەو ئاستەدا ڕاوەستابێت، لە ڕێگا کچە پرچ زەردەکەیان چووە لای کابرایەکی زرتە بۆزی ڕەشتاڵە کە لەسەر کورسییەکی تەختە دانیشتبوو و بێ باکانە، زۆر بەقووڵی مژی لە ئاغزی نێرگەلەکەی نێولەپی دەستی دەدا و دووکەڵەکەی بەبا دەکرد.

کچەکەی تریان کە ئەسمەرێکی پرچ ڕەش بوو، لێم نزیک بۆوە و بەگوێمدا چرپاندی:

(مەهێڵە لەو زرتە زەلامە نزیک بێتەوە، تا بڵێی کابرایەکی بەد و بێ ناموسە، لێرە هەموو کەس باش دەیناسن و دەزانن تەنها ئیشێکی گەوادییە).

گوێم نەدایە قسەکانی و پاش کەمێک هەروەک ئەوەی گەمان بکەین، من کەوتمە پێشیان ئەوان وەدووم کەوتن.

ئاگام لە چوونە پێش و چەشن و چۆنیەتی هەنگاوەکانم نەمابوو، نغرۆی داڵغەیەکی قووڵ ببووم و لە زەینمدا بۆ سەرە هەودایەک دەگەڕام تا لەوێوە بچمە نێو ئەو زەمەنەی کە ئەو کچەم تێدا ناسیوە.

کاتێک ویستم هەڵوێستەیەک بکەم لە شوێن خۆمدا ڕابوەستم توومەزە هەر لە هەوەڵەوە لە شوێن خۆمدا ڕاوەستاوم و ئەویش لە بەردەممدا ڕاوەستاوە و تێم دەڕوانێت.

کە چاوم هەڵهێنا تەنها گلێنە سەوزەکانی چاوی سەرنجی ڕاکێشام، هەروەک ئەوەی دەست بۆ وێنەیەک بەرم ئاوا دەستم بەگلێنەکانی چاویدا هێناوە هەر لە خۆمەوە بەنینۆک هەڵمکڕاند، سەیرم کرد ڕەنگەکەی لێ نابێتەوە.

گوتی:

(من ژینا-م نامناسیتەوە!؟)

نەدەکرا ئەو بێت، گەرچی هەستم دەکرد ئاشنایەتییەکم لەگەڵی هەیە و شتێک پێکەوەمان گرێ دەدات. بەڵام بێجگە لە چاوە سەوزەکانی هیچ شوێنێکی تری لە ژینا نەدەچوو، دوا وێنەی ژینا لە زەینمدا پەیوەست بوو بەو ساتەوەختەی کە بۆ دواجار ژینا هاتە ژێر پەتۆ قرمزییەکەوە؛ لەو ڕۆژەدا کە پیاوە میسرییەکە خەریکی دایکی بوو.

لە ناکاو ئەو کچەی کە دەیگوت من ژینام دایە پرمەی گریان و باوەشی پێدا کردم، نەدەکرا باوەڕ بەوە بهێنم کە ئەم ئەو بێت، ئەستەم بوو گەیشتبێتە شاری شۆلۆ؛ ئەمە جگە لەوەی کە هیچ لۆژیکێکم لەوەدا نەدەبینییەوە کە لە ئێستادا لە هەمان تەمەنی ئەو دەمەی ژینا دابێت.

گوتی:

(ناکرێت منت لە یاد کردبێت، وەبیرت دێت لەسەر داوای خۆت تابلۆی سێبەری سەگێکم بۆ کردیت. هەردەم پێت دەگوتم؛ سێبەری ئەو سەگە ژیانی لێ هەراسان کردووم و لە هەر کاتێکدا کە بمەوێت بەختەوەر بم، ئەو لە سووچ و پەنا و شوێنێکەوە خۆیم پیشان دەدات و بەمەش بەدەنەم ئیفلیج دەکات و ڕۆژی ڕووناکم لێ دەکاتە شەوی تار. بەبیرت دێت ئەو کاتەی هێشتا کە منداڵ بوویت دایکت زوو زوو دەیبردیتە سەر پیاوچاکان و مشایەخان تا چاک ببیتەوە، باشە هەر ترسی سێبەری ئەو سەگە نەبوو هۆکاری ئەوەی کە نەچیتە نێو تاقیکردنەوەکانی دواهەمین ساڵت لە بەشی شانۆ،...

هەر لەبەر ئەویش نەبوو؛ منت لە ژێر پەتۆ قرمزییەکەدا بەتەنێ جێ هێشت!؟).

٨

پاش قسەکانی ئەو کچەی کە دەیگوت من ژینا-م، تەنها چەند شوێنێکی سێبەری سەگەکەم دەبینی کە لە نێو کۆڵانێکی گەڕەکە دێرینەکەدا شوێنگۆڕکێی دەکرد.

کە بەتەواویی هاتە پێش چاوم و لە پێشمەوە کەوتە ڕێ، بەکاوەخۆ

وەدووی کەوتم و بردمییە نێو حەمامێکی ڕۆژهەڵاتییانە، دوای ئەوەی چووینە نێو گەرمخانەکەی، بینیم سەدان پیرەمێردی بەساڵاچوو بەرووت و قووتی لەسەر سەکۆ جیا جیاکان دانیشتوون، دەنگی بەردەوام و یەک لە دوای یەکی بەربوونەوەی جامەکانی دەستیان ئیقاعێکی ترسناکی هەبوو. لەو ساتەوەختەدا ئاگام لە سێبەری سەگەکە نەما و ڕوانیمە ئەو پیرەمێردە جەستە ڕەق و تەقانەی کە ددانێک چییە لە دەمیاندا نەمابوو، پاش کەمێک لەوە حاڵی بووم کە هەموو پیرەمێردەکان بەشێوە لە یەکتر دەچن و هەر هەمووشیان بەیەک شێوەی سامناک و سەیر تێم دەڕوانن و دەتگوت دەیانەوێت شتێکم پێ بڵێن.

خەریکبوو بچمە دەرێ: کاتێک یەکێکیان گوتی:

(ئێستا حیکایەتخوانەکە دێت و وەک هەموو ڕۆژێک هەمان حیکایەتمان بۆ دەگێڕێتەوە، حەز دەکەین تۆش گوێرادێری ببیت).

ئەوەندەی نەخایاند زرتە بۆزێکی ڕەش ئەسمەر بەڕووت و قووتی هاتە نێو گەرمخانەی حەمامەکە و، هەر لە هەوەڵەوە زامە قووڵەکانی زۆر شوێنی جیا جیای جەستەی سەرنجی ڕاکێشام، چەقۆ زۆر درێژە نووک تیژەکەی دەستی، هێندەی زامەکانی بەلامەوە سەرنجڕاکێش نەبوو.

لەسەر سەکۆیەکی نزیک حەوزە گەورەکەی نێوەڕاستی گەرمخانەکە کە هاڵاوی لێ هەڵدەستا، دانیشت.

گوتی:

(وەک هەموو جارێک کە بۆتان دەگێڕمەوە پێتان دەڵێم من بەڕمچەڵەک دەچمەوە سەر ئەوەی یەکێک لە فیرعەونە دەنگخۆشەکان

کە تەنها فیرعەونێکی گۆرانیبێژی نێو نەسلی فیرعەونەکان بووە.

لە ڕۆژگارێکدا پاش بینینی خەونێک کە تا ئێستاش هیچی لێ حاڵی نەبووم، بڕیارم دا بچمە شاری مەخلووقە دەنگ ناخۆشەکان، بەسەرهاتی مەخلووقەکانی ئەو شارەشم لە کتێبێکی کۆندا بەرچاو کەوتبوو.

هەر ئەوەندەی گەیشتمە شارەکە و پاش چەند ڕۆژێک لە بەردەم قەسابێکدا نارەنارێکم لە دەم هاتە دەرێ و پێم وابوو ڕەنگە خۆشحاڵ بێت و لەوێدا بتوانم گۆرانییەک بڵێم. بەڵام تووڕەبوونی گەیشتە ڕادەیەک ئەگەر پیاوەکانی سەیدولرەئیس فریام نەکەوتبان ڕێک و ڕاست لە پاڵ ئەو ئاژەڵانەی کە سەر بەرەو خوار بەقولاپەکاندا هەڵیواسیبوون، هەڵیدەواسیم.

دواتر لەوە حاڵی بووم کە خەڵکی شارەکە، بەهەموو دەنگێکی خۆش هستریا دەیانگرێت و حاڵیان لێ دێت تەنانەت منداڵەکانیشیان هەر لە منداڵییەوە فێری ئەوە دەکرد لە هەموو چەشنە باڵندەیەکی دەنگخۆش بکوژن و بۆ ئەمەش چەشنی جۆراوجۆری داوەلاستیک لەو شارەدا دروست دەکرا، خرکە بەردی نووک تیژیشیان لە قەراغ چەمێکی دوورەوە بۆ کوشتنی باڵندەکان دەهێنا و لە بازاڕدا دەیانفرۆشت.

لەو شارەدا دەستم کرد بەچاککردنی هەموو کەلوپەلێکی کارەبایی نێو ماڵان، هێدی هێدی لەوە حاڵی بووم کە دەتوانم لە ژێرزەمینی ماڵەکاندا گۆرانی بۆ مێینە شەهوەتبازەکانیان بڵێم؛ ئەو مێینانە بەبیستنی دەنگم سەرسام دەبوون و بێجگە لە ماجەرای حیکایەتەکانی نێوگەڵی پیاوان هیچ شتێکی تریان نەدەزانی و لە هیچ کەشوهەوا و وەرزێکیشدا دەرپێیان لە پێ نەدەکرد و هەمیشە ڕێیان

بەهەمـــوو چەشـنـە بـایەکی ســـارد و گـــەرم دەدا، بەنێـــوگـــەڵە هەڵناوساوەکانیاندا گوزەر بکات.

لەو سـەردەمی شـەڕ و شـۆڕ و تۆپبـارانەدا، بەتایبـەت ئەو دەمـانەی سەرجەم خـەڵکی شار شپرزەی ڕووداو و کارەسـاتەکان دەبوون، من لە یەکێک لە ژێرزەمینەکاندا گۆرانیم بۆ مێینەیەک یان چەند مێینەیەکی هاوچەشنی ئەو شـارە دەگـوت. لەو کـاتانەدا زۆر بەخـتـەوەر بووم، چونکە توانیبووم تۆرێکی نهێنی بۆ خۆم بچنم، لە پشت دنیای شاری دەنگ ناخـۆشـەکـانەوە شـارێکی تر بنیـات بنێم کـە پڕ بوو لە دەنگی سـیـحـراوی خـۆم؛ شـارێکی پڕ ئەو مـێـینانەی کـە لێـویـان بەزەردە توێژاڵێکی هەنگوین دەچوو، نیگاکـانیـشـیـان پانتـایـیـەک بـوو لەو بیابانەی کە مووسا لە تاو فیرعەون ڕووی تێ کردبوو.

ئیدی ڕێکەوتێک ئەو دنیایەی پێ جێ هێشتم و منی نـاردە نێو ئەم دنیایەی کە نە دەکرێت گۆرانی تێدا بڵێم و نە لێرەشەوە دەنگم بەکەس دەگات.

ڕێکەوتێک بوو کـە نەدەبوو ڕوویدات؛ ژنـە شـۆفـێـرێکم نـاسی و پاش مـاوەیەک، لە یەکـێک لەو ڕۆژانەی کـە خـەڵکی شـار یادی خۆشـتـرین ڕۆژێکیـان دەکـردەوە، چوومــە لای و لەوەدا بوو وەک هەمــوو جــارێک بچمە ژێرزەمینەکەیان تا لەوێدا گۆرانی بۆ بڵێم؛ بەڵام گوتی:

(با ئەمـڕۆ بچینە ژووری خـەوتن و لـەوێدا گـۆرانییـەکانم بۆ بڵێ. لەم ژاوە ژاو و هەرا و زەنایەدا دنیـا لێمان بێ خـەبەرە و کەسـیش گوێی لە دەنگت نابێت).

بەشـادمـانییەوە لەگەڵیدا چوومە ئـەوێ و وەک هەمیشـە چۆن لە کاتی گۆرانی گوتندا لێی ڕادەکشـام، بەو چەشنە لێی ڕاکشـام و ئەویش لە

پاڵمدا ڕاکشا و ڕەنگە زووربەی ئاوازە سیحراوییەکانی سەردەمی فیرعەونییەکانم، بۆ یەکەم جار لەوێدا و بۆ ئەو گوتبێت.

پاشان نازانم چی ڕووی دا، ڕەنگە لە ناو گۆرانی گوتن لە هۆش خۆم چووبێتم و ئاگام لە خۆم نەمابێت، بەڵام کە لەم حەمامەی ئێوەدا بەئاگا هاتمەوە هێشتاکە هەموو زامەکانی جەستەم خوێنیان لێ دەچۆڕا).

٩

کە لە حەمامەکە چوومە دەرێ سێبەری سەگەکە لە پەنایەکدا چاوەڕێم بوو، نەمدەزانی دەمباتە چ شوێنێکی تریش، دەبوو سەرجەم یادەوەرییەکانم وەبیر بێتەوە، بەڵام وەبیرهاتنەوەی یادەوەرییەکان تا ژێر پەتۆ قرمزییەکە بڕی دەکرد. دەمزانی لە پاش ئەوەشەوە دەیان یادەوەری تر هەیە و هێشتاکە لە زەینمدا شاردراوەیە. هەستم دەکرد سێبەری سەگەکە لە زۆر شت ئاگادارە و شایەتێکی زیندووی ڕووداوەکانە.

هەوڵم دا نەخۆشخانە دەروونییەکانی شارەکە بێنمەوە پێش چاوم، بەڵام سەیر لەوەدا بوو بینایەکی سەربان و سەردیوار تەلبەندکراوم لە بەرچاودا بەرجەستە دەبوو کە ئاڵایەک بەسەریەوە دەشەکایەوە. چەندم کرد نەمتوانی دکتۆرەکە بەجلی پزیشکییەوە ببینم؛ وەک ئەفسەرێک دەهاتە پێش چاوم، لە کاتێکدا بریق و باقی ئەستێرەکانی سەرشانی ئاوی چاوی دەبرد.

لێدان و تێهەڵدانێکی نێو ئەو شوێنەم بیر دەکەوتەوە، هەستم بەئازاری زۆر شوێنی جەستەم دەکرد. قولاپی بنمیچەکەم بیر کەوتەوە

کە پاش ئەوەی هەردوو دەستـمیـان لە پشـتـرا کـەلەپچـە دەکـرد و قایشـێکیـان تێ دەپێچا بەوێدا هەڵیاندەواسیم. وایەرێکی نەرمیـان لەسـەری زەکەرم دەبەست و پاش هەڵسووڕانێکی خێرای دەسکی ئەو ئامێرەی جەماڵی مفەوەزی ئەمن لە ئامێزی خۆی دادەنا، تەزوویەکی پڕ ئازار و بێزارکەر لەو شوێنە هەستیارەوە دەچووە نێو هەناوم و زۆر جـار خـۆم پێ ڕانەدەگیـرا و چۆرە چۆڕی مـیـزی خـوێناوی لە کـونی چووکمەوە فیچقەی دەکرد.

دەنگی خۆم وەبیر دەهاتەوە، کە بە بەدەم هاوارم دەکرد؛ وام دەزانی لە نێو ئەو کۆڵانەی کە لەو کاتەدا پێیدا تێپەڕ دەبووم، سەدای دەنگی ئەو هاوارەی خۆم دەبیستم.

دەمویست بگەڕێمەوە ژێر پەتۆ قرمزییەکە و لەوێوە دەست پێ بکەم، لەوێوە سـەرەهەودای هەمـوو ئەو بەسـەرهاتە بدۆزمـەوە کـە دەبوو لە قووڵاییەکانی زەینمدا خۆی حەشار دابێت.

هێشتاکە لە هەمان ساتەوەختی ئەو عەسرەدا بووم؛ نەمدەزانی ئەو کۆڵانەی کە تابلۆکانی تێدا دانرابوو، دەکەوێتە چ لایەکی ئەو کۆڵانە فراوانەی کە لەو دەمەدا پێیدا ڕەت دەبووم.

گەڕەکەکە زۆر لەوە گەورەتر بوو کە من تەسەورم کردبوو. پێ دەچوو بێ کۆتا بتوانیت لە نێویدا هەنگاو بنێیت.

سێبەری سەگەکە لە چەقی کۆڵانەکەدا ڕاوەستا و بەکووچەیەکی کەمێک هەورازدا هەڵگەڕا، وەدووی کەوتم، هەرکە گەیشتە بەردەم باخچەیەکی گەورە بازێکی بەسەر پەرژینەکەدا دا و چووە ژووری، منیش هەروەک ئەوەی کە سەگێک بم، زۆر بەئاسانی و بەهەمان شێوە بازم بەسەر پەرژینەکەدا دا و چوومە نێو باخچە چڕوپڕەکە.

ڕووەکە بەچنگەکان دیوار و سەربان و هەورەبانی خانووەکەی نێوەڕاستی باخچەکەیان داپۆشیبوو، شەوگەردێک لە سەروو دەرگای سەرەکی خانووەکە هەستی ڕاگرتبوو.

زووربەی ژوورەکانی نێو خانووەکە چۆڵ و هۆڵ بوون، تەنها لە ژوورێکی لاچەپەکدا کەلوپەلت دەبینی کە کورسی و مێزێک و دەیان تابلۆی هەڵواسراو و بارێک کتێبی کەڵەکەبووی تێدا بوو؛ لە هەمووشی سەیرتر ئەو سیسەمە بوو کە پەتۆیەکی قرمزی بەسەردا درابوو کە هەر دەتگوت سیسەمەکەی خۆمە. یەکێک لە تابلۆ هەڵواسراوەکان وێنەی سێبەری سەگێک بوو کە لە دەرگای ژوورێکەوە دەیڕوانییە دوو جەستەی ڕاکشاوی ژێر پەتۆیەکی قرمزی.

چوومە ژێر پەتۆ قرمزییەکە و بۆ تاوێک بەڕاکشانەوە لە بنمیچی ژوورەکەم ڕوانی، کە شێ و دڵۆپەکردنی ساڵانێکی دووروودرێژ زۆر شوێنی پەڵە پەڵە کردبوو، تێکەڵەیەک بوو لە هارمۆنیەتی ڕەنگ کە دەکرا بەڕەنگە جیاوازەکانیدا ژمارەی ساڵەکانی تەمەنی ئەو ژوورەی پێ بزانیت. بۆ تاوێک پێڵووەکانم لێک نا و هەوڵم دا بیر لە هیچ نەکەمەوە. کە چاوم هەڵهێنا هەر دەتگوت لەو ساتەوەختەی ئەو ڕۆژەدام کە ژینا بۆ دواجار هاتە لام، هێندەی نەبرد هەر بەڕاستی بەهەمان جلوبەرگ و شێوە و ئاکاری ئەو ڕۆژەوە هاتە ژوورێ، هەمان ئەو شتانەی دووبارە دەکردەوە کە لەو ڕۆژەدا کردبوونی، دواتر هاتە ژێر پەتۆ قرمزییەکەوە و گوتی:

(دە ئێستا ئەوەم لەگەڵدا بکە کە پێم گوتی).

نەدەهاتەوە بیرم ئاخۆ لەو ڕۆژەدا ئەوەم لەگەڵدا کردووە کە لێی ویستووم، یاخود...!؟

هەستـــامـــە ســـەرپێ و تا نەگـەیشـتــمــە بەر دەروازەی مـــابەینی خـــانووەكـــەی ئێـمـــە و ئەوان ڕانەوەســـتـــام. ســـەیرێكی هەمـــوو ئەو درەختانەم كرد جیاواز لەو كاتانەی كە بەڕاستی لە نێویدا دەژیام، هیچ سیحر و تەلیسمێكی باخچەكەی جارانی نەبوو. گوڵە سوورەكان بۆنیان نەبوو، هەر بەوە دەچوو كە هەموو شتێكی ئەو باخچەیەت لە مادەیەكی بێ گیان دروست كردبێت. چوومە ئەودیوی دەروازەكە و تا ژووری خەوتنی دایكی ژینا ڕانەوەستام، زرتە بۆزە میسرییەكە بەسەر دایكی ژیناوە بوو؛ لە كـاتێكدا هەردووكـیـان خـوێن لە زۆر شـوێنی جەستەیانەوە دادەچۆڕا. هەروەك ئەوەی دەیان دەست بەدەمیان چەقۆی نووك تیـژی زۆر درێژ ســەراپای جـەســتــەی ئەو دووانەی بەو حـــاڵە گەیاندبێت، ئەدەچووە ئەقڵمەوە دەستە ناسكەكانی ژینا بووبێتە دەیان دەست و ئەو دوو بوونەوەرەی ئاوا لێ كردبێت.

كە بەشپرزەیی گەڕامەوە ژینا لە ژێر پەتۆ قرمزییەكەدا دەگریا.

سەری بەرز كردەوە و گوتی:

(من ئەم كوشتوون و ناشزانم كێ كوشتوونی)

نازانم بۆ لەو كاتەدا گوتم:

(بچۆرە مەخفەری پۆلیسی دەستە ڕاستی كۆڵانەكەمان و بڵێ كوڕە شێتەكەی دراوسێمان، دایكم و كابرایەكی پێكەوە كوشتووە، بڵێ هەر ئێستا لە پەیمانگا گەڕامەوە و كە چوومە ژووری ئەو بەچەقۆیەكی زۆر درێژی نووك تیژەوە هەڵدەهات).

ئیدی پاش ئەوە و بۆ ماوەی سێ ساڵ ئاگام لە هیچ هەواڵێكی ژینا نەما، كە لە نەخۆشخانەش هاتمە دەرێ؛ هێشتاكە نەچووبوومەوە ماڵێ، پیرێژنێكی خزمی دایكم كە هەمیشە بەپێی پەتی دەگەڕا، لە

نێوەڕاستی ڕاستەڕێیەکدا بوو بەتووشمەوە و بەبێ هیچ هەواڵ پرسین و چەند و چوونێک گوتی:

(باش ئەوەی تۆ دەستگیر کرایت، ژینا بەوەی زانیبوو کە دووگیانە و زۆر بەبێ دەنگی خۆی سووتاند...

یاخوا دەستت خۆش بێت، بەخوا ئەگەر ئەو میسرییەت نەکوشتایە، تا ئێستا نیوەی کچ و ژنی ئەم شارەی خراپ کردبوو).

پێش ئەوەی پیرێژنەکە جێ بهێڵم، بەدەنگێکی پڕ سۆز و بەزەییەوە گوتی: (کوڕی خۆم باشە خۆت میسرییەکەت بەسەر ژیناوە بینی، یان بۆ خۆی بۆی باس کردیت. وەک دەڵێن: پاش ڕابواردنی لەگەڵ دایکی ئەویشی سەقەت کردووە).

لەو ساتەوەختە کرچ و کاڵەدا سێبەری سەگەکە وەک عفریتێک بەسەر سەرمەوە ڕاوەستابوو، هێندە گەورە و زەبەلاح بوو کە پێ دەچوو هەموو ژوورەکە سێبەرێکی ئەو بێت.

پێش ئەوەی چاوەکانم لێک بنێم و بۆ دواجار بەپەتۆ قرمزییەکە سەری خۆم داپۆشم، سێبەری سەگەکە وەک خۆی لێ هاتەوە و هێدی هێدی خزایە ژێر پەتۆکە و بەتەواوی خۆی پێوە نووساندم.

هەرگیز بیرم لەوە نەکردبۆوە کە ڕۆژێک دادێت؛ من لەگەڵ سێبەری سەگێکدا دەخەوم.

هەستم بەهانکە هانک و هەناسەی گەرمی دەکرد، گوێم لە خیزە خیزی سنگی بوو. دیارە دەبێتە بەشێک لە من و دێتە ناومەوە، ئەگەر هەر لە بنەڕەتەوە بەشێکی من نەبوویێت و لە زەمەنێکدا وەدەرم نەنابێت!؟

کچی و خامۆشی ژوورەکە سامێکی سەیری هەبوو، پاش کەمێک بێجگە لە خۆم هیچ کەسێکی تر لە ژێر پەتۆ قرمزییەکەدا نەبوو.

گوێم لە دەنگی لێدانی دڵم بوو، کە بەدەنگی لێدانی دڵی سەگێک دەچوو؛ سەگێک کە پێش چەند ساتێک لەمەوپێش تەنها سێبەرێک بوو.

بەڵام پێ دەچێت لەمەودوا؛ من و ئەو سەگە تەنها سێبەرێک بین.

# ئەوەی کە ڕووی دا

لە پەنایەکی دوورەدەستی شوێنێکدا دانیشتم؛ کە پێ دەچوو پێشتر شوێن دەرگایەکی گچکە بووبێت و دواتر پڕ کرابێتەوە.

مابەینی بەردەکان بۆش بوون، کەمێک سەرووی شوێنچێگەی کۆنە دەرگاکە دەلاقەیەکی تێدا بوو؛ دوو کۆتری سپی لەوێوە سەرەتاتکێیان لەگەڵ دەکردم.

دەستنووسەکە بەرگێکی ڕەشی چەرمینی هەبوو، بەبۆیەیەکی سپی و بەخەتی فارسی لەسەری نووسرابوو:

(دەستنووسی - پەڵە خەونەکان - نووسینی: س)

لاپەڕەکانی بەچەشنی هێڵکاری هەڵبەزین و دابەزینی دڵی نەخۆشێک ڕەش کردبۆوە. هەندێ لاپەڕەی ڕاست و چەپی بەسەردا هێنرابوو؛ هەندێکیشی لێکرابۆوە. دوا لاپەڕەی دەستنووسەکەش ئیمزای -س-ی پێوە بوو.

سەرێکم هەڵبڕی و ڕوانیمە دەورویشتی خۆم!؟

خۆم لە نێو ئۆتۆمبێلێکی مۆدێل کۆندا بینییەوە، بێجگە لە من شۆفێرەکەی سێ کەسی دیکەی تێدا بوو. تەنها دەیانڕوانییە وێنەیەکی هەڵواسراوی سەر جامی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکە. لە وێنەکە وردبوومەوە و هیچی لێ حاڵی نەبووم، تەڵخ و تێکەڵ دەهاتە بەرچاوم، شۆفێرەکەش بەبێ چاوتروکاندن؛ دەیڕوانییە هەمان وێنە.

لە کەسی ئاسایی نەدەچوون، بێ جووڵە و یەیکەرئاسا تەنها لە یەک خاڵیان دەڕوانی. وردتر سەرنجی ئۆتۆمبێلەکە دەگۆڕدران.

هەندێک جاریش هێور دەبوونەوە و لە زۆر ساتیشدا دەوەستان.

ئۆتۆمبێلەکە بەنێو شارۆچکەیەکدا تێپەڕی...

لە هەموو سووچ و قوژبن و کووچە و کۆڵان و گۆڕەپانێکیدا، پەیکەر و وێنەی کەسێک دووبارە دەبۆوە.. کە تێم دەڕوانی بەرچاوم تەڵخ دەبوو؛ هیچم نەدەبینی و پاشان لە بەرچاومدا ون دەبوو.. هیچ بوونەوەر و زیندەوەرێکت نەدەکەوتە بەرچاو...

تەنها شتێک کە ژیانی وەبیر دەهێنایەوە، درەختێکی بەساڵاچووی نێوەڕاستی گۆڕەپانی سەرەکی شارۆچکەکە بوو.

دواتر ئۆتۆمبێلەکە هاتەوە سەر شاڕێگەی سەرەکی و بەلۆفەکانی چیایەکی بەرزدا هەڵگەڕا و پاش ماوەیەک گەیشتە سەر لووتکەی چیاکە و شەومان لێ داهات.

شۆفێرەکە لە بەردەمی کۆشکێکدا ئۆتۆمبێلەکەی ڕاگرت؛ کە لە نهۆمە بەرزەکانیدا یەک دوو چرا دەسووتان. پاش ئەوەی هەر چوار دەرگاکەی واڵا کرد، ئەوان دابەزین و جێیان هێشتم.

کە ئۆتۆمبێلەکەم جێ هێشت، تاوێک بەسەرسامییەوە ڕوانیمە

دەورووپشتم.. دارستانێکی بەسام و چڕوپڕ چواردەوری کۆشکەکەی دابوو، نەمدەزانی بەرەو دارستانەکە مل بنێم؛ یان بچمە نێو ئەو کۆشکە نهێنییەی کە نەمدەزانی چی تێدایە. هەر چۆنێک بوو، ڕێگەی ناو دارستانەکەم گرتە بەر و تاوێک هەنگاوم نا، لاقم دەنێشا، سەرم وەگێژەوە دەچوو، بەئەستەم خۆم بەپێوە دەگرت.

پرسیارەکان لە مێشکمدا هێندە زۆر بوون، کە هیچیانم بۆ وەڵام نەدەدرایەوە. دەنگ و خشپە و هانکە هانک و هەناسەبڕکێی چەند شتێکم دەهاتە گوێ.. جار جارە بەڕیتمێکی بەرز دەنگی باڵندە و دەعبای سەیروسەمەرەم دەبیست.

دارستانێکی چڕوپڕ و تاریک بوو، تەنها سێبەری تارماییەکانت دەکەوتە پێش چاو. پاش سەعاتێک هەنگاونان و ڕۆیشتن، لە نێو کۆمەڵێ دەوەنی چڕوپڕدا کانییەکم بینییەوە.

هێندە تینووم بوو، هەر یەکسەر لێی ڕاکشام و دەمم لە کانییەکە وەردا. بەڵام هەروەک وێنەیەکی بەدەست کێشراو بێت، قومە ئاوێک نەچووە دەممەوە.

کە لێی دوور دەکەوتمەوە؛ دەبووە کانییەکی ڕاستەقینە و کرمۆکە و زیندەوەرە ئاوییەکانی نێوی دەکەوتنە جووڵە، ئاوێکی سازگاریشی لەبەر دەڕۆشت.

دار و درەخت و گژوگیای نێو دارستانەکەش، کە دەستی منیان دەگەیشتێ، لە جێی خۆیان وەک وێنەیەک ڕادەوەستان و نەرمی و نیانییان تێدا نەدەما.

پێ دەچوو لە نێو دارستانێکی پڕ وێنە و دیمەنی جۆراوجۆردا، وێڵ و

عەودالّ بوو بێتم.

لە هەر ڕێچکە و ڕێگەیەکی دارستانەکەدا ڕێگەم گرتبایەتە بەر، هەر دەچوومەوە بەردەم کۆشکەکە.

پاش ئەوەی بێهوودە بەنێو دارستانەکەدا دەیان جار گوزەرم کرد و تێپەڕیم، بەپلیکانەیەکی دووردرێژدا هەنگاوم نا و چوومە سەر.. بەدرێژاییی شەو پێ پلیکانەکانم بڕی و لە بەرەبەیاندا خۆم لە بەردەم یەکێک لە دەرگاکانی کۆشکەکەدا بینییەوە.

گەرچی هەروەک ئەوەی کە دەرگاکە داخراو بێت؛ زۆرم لێ دا و چاوەڕێم کرد. بەڵام دواتر هەستم بەوە کرد، کە دەرگاکە هەر لە سەرەتاوە بەکراوەیی جێ هێڵدرابوو.. هێدی هێدی دەرگاکەم تەواو خستە سەرپشت و چوومە نێو هۆڵێکی گەورە. لە هەموو سووچ و پەنایەکیدا وێنە و مۆمیای باڵندە و ئاژەڵی جۆراوجۆرت دەبینی.. بەدیوارەکانییەوە چەندەها چەشنی جۆراوجۆری چەک و تفاقی ڕاوکردن هەڵواسرابوو.

دواتر بەپێ پلیکانەیەکی تەسک و تروسکدا، کە بەرەو نهۆمی دووەمی کۆشکەکە دەچوو، سەرکەوتم. هەرکە گەیشتمە سەرێ خۆم بەرانبەر بەهۆڵێک بینییەوە، کە لەسەری نووسرابوو «هۆڵی کتێبخانە». چوومە ژوور و کەوتمە تاوتوێکردنی کتێبەکانی: سەرجەم کتێبەکانی مێژوویی بوون.. ئەوەی کە پاش تاوێک کەوتە بەر دەستم و سەرنجی ڕاکێشام. دەستنووسی (پەڵە خەونەکان) بوو.

لەسەر کورسییەکی لە تەختە دروستکراوی نزیک مێزێکی شووشە دانیشتم و کەوتمە خوێندنەوەی دەستنووسەکە: «..........؟!!»

پاش کەمێک دەستنووسەکەم جێ هێشت و لە پەنجەرەی هۆڵەکەوە ڕوانیمە دەرەوەی کۆشکەکە. لە شوێن جێگەی دارستانەکەدا پانتایی بیابانێکم هاتە پێش چاو، قولەیەکی سپی لە نێوەڕاستیدا بەحەوادا چووبوو.

بەپەیژەیەکدا کەسێکی دەمامککراو هەڵزنا و گەیشتە بەرزترین ئاستێکی قولەکە.. دەستنووسێکی بەرگ ڕەشی چەرمینی لە هەگبەکەی دەرهێنا؛ لە نێو ئەو سندووقەی نا کە لەسەر قولەکە ڕاگیر کرابوو. ساتەوەختێک دیمەنەکە لە بەرچاومدا وەک خۆی مایەوە. پاشان قولەکە و سندووقەکەی سەری بەچەشنی کاغەز داباریە خوار.

ڕوانیمە دەستنووسەکە؛ کە پێشتر لەسەر مێزەکە جێم هێشتبوو، لە شوێن خۆیدا نەمابوو.. هەموو سووچ و قوژبنێکی کتێبخانەکە گەڕام، چەکمەجە و دەرگای دۆڵابە داخراوەکانم یەک لە دوای یەک کردەوە و هیچم نەبینییەوە.

کۆشکەکەم جێ هێشت و پاش ئەوەی گەیشتمە سەر کانییەکی نێو دارستانەکە.. بۆ تاوێک ڕۆچوومە نێو خەونەساتێکی خۆڵەمێشی.

بایەکی سارد بەئاگای هێنامەوە کە نەرمایی گوێچکەمی تووێکاری دەکرد...

بۆ دواجار خۆم لە نێو ئۆتۆمبێلێکی کۆندا بینییەوە... هێشتاکە لە جێی خۆماندا ڕاوەستابووین و سەیری گۆڕانی وێنە و دیمەنەکانی دەورووپشتی خۆمانمان دەکرد.

## دوا نامەیەک؛ کە هاوڕێکەم نووسی

کاتێک لە بەردەم قەڵا زۆر دێرینەکەی شارۆچکەکەدا ڕاوەستابووم. گوێم لە تەهلیلە و زیکری ئەو دەروێشانە بوو؛ کە لە پێش حەشامەتەکەوە دەڕۆیشتن.

هەر لە خۆمەوە وەدووی ئەو حەشامەتە کەوتم کە زۆر بەبێدەنگی گوێیان بۆ دەنگی دەروێشەکان هەڵخستبوو.

پاش ئەوەی حەوت جار بەدەوری قەڵاکەدا سووڕانەوە، ڕێگە بەردەڵانەکەی دەستە چەپی قەڵاکەیان گرتە بەر. دوای ماوەیەک گەیشتنە نێو تاکە گۆڕستانێکی شارۆچکەکە؛ کە زۆر لە شارۆچکەکە گەورەتر و فراوانتر بوو. لە نێوەڕاستی گۆڕستانەکەدا حەشامەتەکە بەشێوەیەکی بازنەیی، چواردەوری تابووتێکیان تەنی و پاشان بەچوارمشقی و هەریەک لە شوێنی خۆیدا دانیشت.

تاوێک بەبێدەنگی وەک هەر کەسێکی نێو حەشامەتەکە، بەچوارمشقی لە شوێن خۆمدا دانیشتم.

نە چاوم لە جووڵەی هیچ کامێکیان و نە گوێشم لە دەنگی هیچ کەسێکیان بوو.

لە ناکاو هەروەک ئەوەی کەسێک پێی گوتبێتم: هەستامە سەرپێ و ڕوانیمە تابووتەکە. پەتۆ ڕەشەکەی سەری زۆر سەرنجی ڕاکێشام.

لە جێی خۆم دانیشتمەوە و پاش کەمێک تێفکرین لەبەر خۆمەوە گوتم:

«باشە بۆ لە یەکێکیان نەپرسم!».

ڕووم کردە ئەو زرتە زەلامە ڕدێن سپییەی کە بێ جووڵە لە پاڵمدا دانیشتبوو:

«لالۆ حەز دەکەم بزانم تابووتەکە کێی تێدایە؟».

پاش ئەوەی هەمان پرسیارم بۆ چەند جارێکیش دووبارە کردەوە، هیچ وەڵامێکم نەهاتە بەرگوێ.

بۆ تاوێک لە شوێن خۆمدا کڕ بووم، دواتر بۆ جارێکی تریش هەستامە سەرپێ و ئەمجارەیان تا نەگەیشتمە لای تابووتەکە ڕانەوەستام.

پاش ئەوەی هیچ کەسێکی نێو حەشامەتەکە دەنگی لێوە نەهات. بەکاومخۆ پەتۆ ڕەشەکەی سەر تابووتەکەم هەڵدایەوە، تا سێ بەشی تابووتەکە هیچم نەبینی.

لە دوا بەشیدا، سەری کەسێکم کەوتە بەرچاو کە هێشتاکە چاوەکانی کراوە بوون.

لەوەدا بوو کە بچمە دەرێ؛ بەتوندی لە دەرگا درا.. دەرگاکەم کردەوە و سەر و سیمای خوێناوی ئەو زاتەم بینی.. هاوارێکم لە زار دەرچوو، پاشـــان زارەترەک بووم و نەمـــوێرا پاڵی پێـــوە بنێم و هـەڵبــێم .. پشتاوپشت گەڕامەوە و لە قوڕنەیەکی ژوورەکەمدا بەچۆکدا هاتم و هەموو گیانم کەوتە لەرزین، ئارەقەیەکی سارد لە هەموو کونۆچکەکانی جەستەم دادەچۆڕا.. ڕەنگم تا دەهات تەڵختر دەبوو، تەنها ئەندێشەی سکرینی ســـینەمـــایەک بەمـــێشکمدا گـــوزەری دەکـــرد و ئاکـــاری تیـمسـاحـێک کە بەمنداڵی لێی ترسابووم، پەیتا پەیتا دەهاتە پێش چاوم.

پاش ئاوێک ئارماییەکە ڕووی تێ کردم و بەدەنگێکی گڕ گوتی:

(– نەدەبوو بمکوژی، دەبوو زانیـبـات ئێـمـە برای یەکـدین و تەنـها باوکمان جودایە!

– بەڵام من شتی وام نەزانیوە...

– دەبوو زانیـبـات کـە هەفـتەیەک پێش ئەوەی بمکوژیت، لە کـاژێری دوازدەی شـەودا، مـارینام مـارە کرد و پاش سێ کاژێریش کـچێکمـان بوو، ناومـــان نا بـالارینا.. ئێـــســـتـــا مـــارینا بێـــوەژنە و بالاریناش هەتیوو...).

ترس وەک بارەشی هاوینان جەنگڵستانی ناخمیان گڕ دەدا و جار جارەش شتێ لە سۆز و بەزەییان تێدا دەبزواندم کـە دەمێک بوو لە ناخـــمـــدا مـــردبوو.. پێش کـــوشـــتنی ئەم نەگـــریســـە، بیـــرم لە هیچ کوژراوێکیـان نەکردۆتەوە و بۆ ساتێکیش بێـزاریان نەکردووم. نازانم (س) بۆ ئەمـجارە کـوشتنی ئەم نەگبـەتەی بـەمن سپـارد، دەبێت چی کـردبێت.. پێ نەدەچوو هـیچ تاوانێکی کـردبێت.. زیـاتر وەک شـێـتـێک

دەهاتە بەرچاوم...

تۆ بڵێی پلانێک بەدەستەوە بێت بۆ کوشتنی شێتەکان!؟

دەنگی ناڵە و گریانێکی شێتانە، زریزەی ئەندێشەکانیان پەرت کردم و ڕوانیـــمـــە ئەو تارمـــاییـــیــــەی کــە تا دێت شـین هەڵدەگـــەڕێت و هەڵدەئاوسێت. لە بەردەم وێنەی خۆم و خێزانەکەمدا دەگریا، زۆرم لە خۆم کرد و بەترسەوە پێم گوت:

(- بۆ دەگریت؟!

- ئەوە وێنەی مـارینا-یە بەجلکی بووکێنییەوە، چ زوو فریاکەوتی مارەی بکەیت!؟

- مـارینا-ی چی! ئەوە فـاتمی ژنمە و شـەش مـانگ لەمـەوپێش لە کارەساتێکدا تێدا چوو.

- کوا بالارینا-ی کچم؟

- بالارینا-ی چی! تەنها یەک کوڕمان بوو؛ ئەویش سـەری بەسـەرە ئەسپ دەچوو، ئەمە جگە لەوەی لەشێکی سـەیروسـەمـەرەشی هەبوو.. هەر بۆیە بەزیندوویتی زیندەبەچاڵم کـرد و لەو دەمــەشــەوە فـێــرە کوشتنی بنیادەمان بووم.

- درۆ دەکەی..

- درۆ ناکەم.

- ناکا کچە پێنج ساڵانەکەی منت کوشتبێت...)

پاش ئەوەی قــەبارەی سێ هێندەی خــۆی گـەورە بوو، وەک شـــەک بەرانێکی ئەفسووناوی شاڵاوی بۆ هێنام، دەستی دایە ئێخەم و یەک دوو تفی خەستی کردە نێوچاوانم...

لە بگرە و بەردەیەکی کەمخایەندا هێندەی نەمابوو کە بمکوژێت... لە ناکاو دەرگاکە بەتوندی لە لایەن کەسێکی نادیارەوە لێ درا و پاش تاوێک، تارمایییەکە وەک گەواڵەهەوری بەهاران لە بەرچاومدا ڕەوییەوە و هیچ گێرمە و کێشەیەک نەما.

تەنها خۆم بووم لە نێوەڕاستی عەردی ژوورەکەدا، وەک مردووی سەر تاتەشۆرێک ڕاکشا بووم...

ئیدی پاش ئەوەی کەمێک هاتمەوە سەر خۆم و وچانێکم دا؛ هەر لەو ساتەوە کەوتمە سۆراخی ناو و ناونیشانی.. تا بەڕێکەوت لە یەکێک لە کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا و بەدیوارێکەوە پۆستەرێکی هەڵواسراوم بینی کە لەسەری نووسرابوو:

(شوان کەریم باپیر-ی تەمەن بیست و پێنج ساڵ، کە وەک ئەکتەرێکی شانۆ لە تیپی - ش -دا کاری دەکرد، بەدەستێکی چەپەڵ کوژرا).

چوومە نێو ئەو تیپە شانۆییە و بوومە ئەکتەرێکی کۆمبارس و بەهەزار چەند و چوون خۆم لە یەکێک لە هاوڕێکانی نزیک کردەوە و شتێکم سەبارەت بەژیانی چنگ کەوت...

لەگەڵ مارینا ناوێکدا پێوەندی خۆشەویستی هەبووە و لەبەر هەر هۆ و هۆکارێک بووبێت، لە لایەن کەسێکی نادیارەوە دەکوژرێت...

کە لە هاوڕێکەی شوان-م پرسی؛

(- باشە هەفتەیەک پێش ئەوەی کە بکوژرێت مارینا-ی خواستبوو!؟

- ئەوان بەدەر لە هیچ ڕەسمیاتێک و هەر لەو کاتەوەی کە یەکترییان خۆشویستبوو، هەموو ئەوەی کە ژن و مێردی ئاسایی دەیکات

کردبوویان.. بەڵام بێجگە لە من کەس نەیدەزانی، نازانم دواتریش...).

نەیهێشت لەوە زیاتر پرسیار بکەم و منیش بۆ ئەوەی هیچ گومانێکی لا دروست نەبێت، قروقەپم لێ کرد. کەوتمە غایەڵەی ئەوەی کە ناکرێت پێوەندییەکی ئاوا منداڵێکیشی لێ کەوتبێتەوە، بەتایبەت ئەمەنی کچە بووبێتە پێنج ساڵ و کەسێک لاقەی نەکردبێت و نەیپرسیبێت؟!

بەخۆمدا شکامەوە و لەبەر خۆمەوە گوتم:

(چەند بێ ئەقڵم، خەریکە خۆم بەشتێکەوە سەرقاڵ دەکەم کە پاش سێ سەعات لە ئیزدواجی لەگەڵ ئافرەتێکدا کچێکی بووە و ناوی ناوە بالارینا...).

هەرچەندە دەمویست قەناعەت بەخۆم بکەم کە هیچ لە گۆڕێ نییە و هەموو ئەوەی کە ناڕەحەتی کردووم تەنها خەونێکی ناخۆشە و هێدی هێدی لە بیرم دەچێتەوە. بەڵام هێندەی نەبرد بێ ئاگا بەرەو شوێنی ڕووداوەکە هەنگاوم نا، لە کاتێکدا کە نەدەبوو پاش ماوەیەک لاشەکە هەڵنەگیرابێت و هەر لە شوێن خۆیدا کەوتبێت؛ بەڵام سەیر لەوەدا بوو لاشەکە هەروەک ساتەوەختی کوشتنی؛ وەک خۆی مابۆوە... تەنها شتێک کە دیار نەمابوو، ئەو چەقۆ گەورەیە بوو کە لەسەر سنگیم چەقاندبوو، ئەمە جگە لەوەی شوێن جێگەی چەقۆکەش بەسەر سنگییەوە دیار نەمابوو. تا گومانم کرد لەوەی کە کوشتبێتم و پێم وابوو ڕەنگە هەر وا بەخەوتوویی جێم هێشتبێت.. بەڵام ئەوەش نەدەکرا و ڕێی تێ نەدەچوو.. خەریکبوو دەست بۆ لاشەکە بەرم، کاتێکم زانی مێش و مەگەزێکی زۆر دەوریان تەنیم، کە پێشتر لەسەر کەلاکی سەگێکی تۆپیو نیشتبوون. لەو ساتەوەختەدا خەریک دەبوو

شێت ببم و زوو زوو ئەو قسەیەم بیر دەکەوتەوە کە پێم وابوو پێی گوتبێتم:

(دەبوو زانیبات ئێمە برای یەکدین و تەنها باوکمان جودایە)

خەریک دەبوو مێشکم دەتەقی، ئەو زاتە بەتەواوی سەرقاڵی کردبووم و ماوەیەک بوو لە (س) ترازا بووم و نەمدەویست ببینم، گەرچی چەند جارێکیش بەدوویدا ناردبووم.

بێهوودە بەشوێن شتێکدا دەگەڕام و بەدرێژایی ئەو ماوەیەش نەمدەویست بگەڕێمەوە نێو خانووە کەچەویەچەکەم.. هەر ڕۆژەی لە ماڵە خزمێک، ئوتێلێک، کەلاوەیەک؛ یان لە پێچ و پەنای کووچە و کۆڵانێکدا تا بەیانی خۆم مەڵاس دەدا.

لە ئێوارەیەکی نارنجیدا کە هەر کتومت لەو ئێوارەیە دەچوو کە شوان-م تێدا کوشت، مەگەر نەبوونی قردێلە مۆرەکانی تاقی ئاسمان، جیاوازییەکی لە مابەینی ئەو دوو ئێوارەیەدا دروست کردبایە.. لەو ئێوارەیەدا و بەدەر لە ویستی خۆم و بەبێ هیچ مەبەستێک، خۆم گەیاندە بەردەم وێنە زۆر گەورەکەی دوا شێخێکی شارەکە کە هەمیشە لێوەکانی بزە و خەندەی لێ دەباری.

بەڵام کە بەتیلەی چاو تێم ڕوانی، غەزەب لە نێوچەوانی دەباری.. لەبەر خۆمەوە گوتم:

(تۆ بڵێی ئەویش ئەم نەگریسە بناسێت و ناڕەحەت بێت بەوەی کە کوشتوومە).

پێ دەچوو منیش شێت بووبێتم، ئەگینا نەدەکرا کەسێک ئاقڵ بێت و غەزەب لە نێوچەوانی وێنەی کەسێکی مردوودا ببینێتەوە.

کچێکی پێنج ساڵانی چاوشین، لە پەنا خۆمەوە و وەک من دەیڕوانییە وێنەکە، شرویر و پێڵاوێکی پەڕۆی لە پێدابوو.

زۆر بەوردی دەیڕوانییە ئەو وێنەیەی کە دەمێک ساڵ بوو بۆیەکەی کاڵ ببۆوە.. چەند جارێک ڕوانیمە منداڵەکە و هەستم بەهیچ نەکرد، بەڵام هەر پاش ئەوەی کە بایەکی توند هەڵی کرد.. ئەوم لێ بووە بالارین؛ هەر بەتەواوی شوان-ی دەهێنامەوە پێش چاو و هەر دەتگوت پارچەیەکە لەو بنیادەمە...

لە کاتێکدا کە بیرم لە زۆر شت دەکردەوە، هەستم بەبوونی.. دوو تارمایی کرد کە هێدی هێدی نزیک دەبوونەوە.. ڕووم وەرچەرخان و ڕووکاری ڕەش داگەڕاوی یەکێکیانم بینی کە یەکێک بوو لە دۆستە نزیکەکانی (س).. لەوەدا بوو بڕوانمە ئەوەی تریشیان کاتێک قورساییەک بەرسنگم کەوت و خوێنێکی ڕەش لە نێو قامکەکانمەوە داچۆڕایە خوار، بەنێو تیکی کاشییەکاندا ڕێچکەی بەست.. ئاسمان ڕەش داگەڕا و درەختەکانیش هەر ڕەش و ساختمان و بیناکانیش وەک وردە گەردی خۆڵ دەهاتنە خوار...

تەنها شتێک کە لە دوا ساتەکاندا سەرنجی ڕاکێشام، وێنەیەکی زۆر بچووکی ئەو کچە بوو، کە لە بەشی خوارەوەی وێنەکەی شێخدا و لە سووچێکدا هەڵواسرابوو...

چاوەکانی بەچاوی ئەو کچە دەچوو کە کەمێک لەمەوپێش لە پەنامدا ڕاوەستابوو.. لە کاتێدا کە بەسەرسامییەوە تێی دەڕوانیم، چەند دڵۆپە فرمێسکێکیش هێندەیان نەمابوو سنووری قەتیسبوونیان ببەزێنن و دڵۆپ دڵۆپ بڕژێنە خوار.

# خورافاتی چاویلکەکەی باپیرم

[نەمدەویست هیچم لەو خەونە بێتەوە یاد.. کە دڵنیا نەبووم لەوەی کەی و چۆن بینیبووم!؟ بەڵام ئەوەی کە لام ئاشکرابوو، شکانی چاویلکەکەی باپیرم بوو لە نێوەڕاستی خەونەکەدا.. نەشمدەزانی بۆ لە نێوەڕاستی خەونەکەدا دەبوو چاویلکەکەی بشکێت؛ یان بۆ تەنیا ئەو دیمەنەم وەیاد دەهاتەوە و پێشەکی و کۆتایی خەونەکەم لا پەنهان بوو...]

باپیرم پێش مردنی پێی گوتم:

(کوڕم تەنها شتێک کە بۆتی جێ بهێڵم و دەبێت بەڵێنم بدەیتێ کە پارێزگاری بکەیت؛ ئەم چاویلکەیەیە.. ئاگادار بە کە کردنە چاوت، دەبێت تەنها لە کاتی خەوتندا دایگریت.. مێژووی ئەم چاویلکەیە کۆنە، من بۆ خۆم لە پیاوێکی گەڕیدە چنگم کەوتووە، کە پێش ئەوەی ئێرە جێ بهێڵێت و لە ڕێگەی دەریاوە بگەڕێتەوە وڵاتەکەی خۆی؛ لە ئێوارەیەکی باراناویدا بانگی کردم و زۆر بەسانایی پێی گوتم: حەز دەکەم یادگارێکت لا جێ بهێڵم کە هەرگیز نابێت بیفەوتێنیت و

هەردەم دەبێت پارێزگاری بکەیت). پاش ئەوەی قسەکانی تەواو کرد، کەفێکی سپی لە دەمی باپیرمەوە هاتە دەر و سەرجەم پەتۆ و لباد و پێخەفی ژوورەکەی پڕ کرد لەو کەفە سپییەی کە بێ وەستان زیادی دەکرد و پێش ئەوەی بگاتە ئاستی دەستی ڕاستی کە چاویلکەکەی لە نێودا بوو، زۆر بەئەستەم دەرم هێنا، هەروەک ئەوەی قایل نەبێت بەوەی کە دواجار تاقە میراتییەکەی خۆیم پێ ببەخشێت.. ڕەنگە پەشیمان بووبێتەوە لە بەڵێنەکەی!؟ سەیر لەوەدا بوو بەمردوویتیش نەیدەویست دەستبەرداری ئەو چاویلکەیە بێت؛ کە بێگومان نهێنییەک یان تەلیسمێکی لە خۆ دەگرت!؟.

بەیارمەتی چەند پیاوچاکێکی گەڕەک، باپیرمم بەپێی وەسیەتەکەی خۆی لە جێگەیەکی دوورەدەست و هەوراز و عاسیدا ناشت.. پاش تێپەڕبوونی چەند هەفتەیەک چاویلکەکەم لە سندووقە تەختەکە دەرهێنا کە بەیاقووت و سەدەف و مووروو و مرواری جۆراوجۆر ڕازابۆوە.. سەرنجم دا ڕەنگی گۆڕدرا بوو، دیاربوو ئەمە یەکێک بوو لە نهێنییەکانی ئەو چاویلکەیە؛ هێشتاکە وێنەی باپیرم بەهاوێنەکانییەوە دەبینرا..

زێدەتر لێی وردبوومەوە، چاوە ڕەشەکانی باپیرم لە پشت هاوێنەکانەوە تێیان دەڕوانیم.. خێرا لە جێگەی خۆی دامنایەوە و سندووقەکەشم خستەوە سەر ئەو تاقەی کە کتێبە پیرۆزەکەی لەسەر دانرابوو کە هەردەم باپیرم لە بارمیەوە دەیگوت:

(ڕۆڵە لەم کتێبەدا خودا مێژووی ئێمە دەگێڕێتەوە.. ڕۆژگارێک دێتە پێش کە پێویست دەکات بۆی بگەڕێیتەوە؛ بەڵام نەکەیت بهێڵیت کەس لاپەڕە پیرۆزەکانی هەڵبداتەوە).

ئیدی ئەو کەسانەی کە لە نزیکەوە باپیرمیان دەناسی، بەشێوازی جۆراوجۆر حەکایەتی ئەو چاویلکەیەیان بۆ گێڕامەوە، زۆربەیان پێیان وابوو کە ئەو دەمەی باپیرم لە کولیەی حەربییە لە ئەستەنبوول خوێندوویەتی.. پیاوێکی جوولەکە کە ئەو دەمە هاوڕێی باپیرم بووە و زۆری خۆشویستووە پێی بەخشیوە.. تەنها کەسێک کە ڕایەکی پێچەوانەی هەبوو، پیرێژنێکی جادووگەر بوو کە بەردەوام سەردانی باپیرمی دەکرد و زۆر پەنهان و نهێنی لە نێوانیاندا هەبوو.. پێی گوتم:

(ڕۆڵە هیچ دوودڵییەکی ناوێت، ئەم چاویلکەیە چاویلکەکەی مێجەرسۆن-ە.. نازانم کەی و چۆن دزراوە و گەیشتۆتە دەست باپیرت.. یان خوا پێم نەگرێت، وەک دەڵێن باپیرت بەزۆر لە دزەکەی سەندووە، یان ڕەنگە لێی کڕیبێتەوە.. ئەوەش بزانە کە چاویلکەکە تەلیسم و نهێنی خۆی هەیە کە ناکرێت من هیچت لە بارەیەوە پێ بڵێم).

ئیدی مێژووی چاویلکەکە هەر چییەک و هەر چۆنێک بوو بێت، ببووە مایەی بێزاری و نیگەرانیم چونکە بەردەوام دەبوو بیپارێزم و بەپێی وەسیەتەکەی باپیریشم دەبوو هەردەم لە چاوم بێت، بەڵام تا ئەو کاتە هێشتاکە نەموێرابوو لە چاوی بکەم!؟

تەنها لەبەرئەوەی نەمدەویست لە وەسیەتەکەی لابدەم، چوومە لای دکتۆر و فەحسی چاوم کرد.. کە دیارە تا ئەو دەمە هیچ لاوازییەکم لە بینیندا نەدەبینییەوە و نەمدەزانی چۆن چۆنی دکتۆر قایل بکەم کە هاوێنەیەکی پلە نزمم بۆ بنووسێت؛ تا بتوانم چاویلکەکەی باپیرم لە چاو بکەم.. بەڵام دوای ئەوەی چاوی فەحس کردم و زۆر بەوردی لێی وردبۆوە.. هێندەی نەبرد چاویلکەکەشی فەحس کرد.. بێ سێ و دوو

گوتی:

(ئەم هاوێنانە لەگەڵ چاوی تۆدا دەگونجێن و پلەی چاوت نەگۆڕاوە).

زۆر بەنیگەرانییەوە پێم گوت:

(دکتۆر، ئەم چاویلکەیە هی باپیرمە و تەنها بۆ چاوی ئەو دەبێت).

لە وەڵامدا گوتی:

(کاکە خۆ من گاڵتەت لەگەڵ ناکەم، هاوێنەکانی پراوپڕی لاوازی چاوی خۆتن.. هیچ گۆڕینی ناوێت).

ئەو ئێوارەیەی عیادەکەم جێ هێشت خۆڵباران بوو، بەچەشنێک هەموو دوکان و بازاڕ هەڵگیرابوون. جار جارە پیادەڕەوێکت دەبینی کە بەپەلە تێدەپەڕی، ڕەنگە لە مێژووی ئەم شارەدا خۆڵبارانی وا ڕووی نەدابێت!؟ سەیر لەوەدا بوو ژمارەی سەگەکانی نێو شار زیادیان کردبوو، دووان و سیان لە پەنا و پەسێوی ماڵ و دوکان و کەلاوەکاندا دەبینران؛ سەرباری ئەوەی کە ناو بەناو یەکدییان بۆ چەند خولەکێک بەنێو شەقامەکانی شاردا ڕاودەنا.. پاشان گەماڵەبۆرێک و دەڵێکی سپی لە نێوەڕاستی گۆڕەپانێکدا جووتبوون؛ زۆر چاوەڕێم کرد گەماڵەکە لە کۆڵی دەڵەکە نەدەبۆوە.. تەلاشە بەردێکم تێ گرتن و هوهام لێ کێشان، گەماڵ و دەڵەکە پاشەڵیان کەوتە بەرامبەر یەک و نەیاندەتوانی لێک جیا ببنەوە.. ئەندامەکانیان پێکەوە لکابوون.. دیمەنێکی زۆر سەیریان هەبوو کە پێشتر نەمبینیبوو.. نەمدەزانی جووتبوونی سەگ بەم چەشنەیە!؟

دواتر بەزەییم پێدا هاتنەوە و جێم هێشتن.. ترسم لە لەچاوکردنی چاویلکەکە هەبوو، چونکە نەمدەزانی چ تەلیسم و نهێنییەکی تێدا

هەیە و چی ڕوو دەدات؛ سەرباری ئەوەی کە دەترسام لە یەکێک لە قەرەباڵغی و حەشامەتەکاندا بەربێتەوە و لە نێوەڕاستدا دوو کەرت بێت و بشکێت، بەتایبەت کە من بۆ خۆم سەرم لە ئامادەبوونی فیستیڤاڵ و بۆنە و ئاهەنگ و مەراسیمەکان دەخورا؛ لەبەر هۆکارێک کە بۆ خۆم تەواو بۆم دەستنیشان نەدەکرا و نەمدەزانی...

ڕەنگە لەبەرئەوە بووبێت کە لە یەکێک لە بۆنەکاندا کچۆڵەیەکی ئەسمەری چاوڕەش هاتە پاڵمەوە و گوتی:

(دەمێکە چاودێریت دەکەم و زەمەنێکە خۆشم دەوێی)

کە بەوردی تێم ڕوانی تابلۆکانی گۆگانم هاتەوە یاد.. هەستم بەپڕی جەستەیی و کەرموکوڕی ئامێزی دەکرد.. زۆر کەم دەدوا، بەلام کاتێک زاری بەش دەکردەوە، کەمێک خوار و خێچی لە ددانەکانیدا هەبوو.. کە ببووە مایەی جوانییەکی سیحراوی.. زێدەتر حەزم بەمژینی لێوەکانی دەکرد و ئارەزوویەکی سێکسی زۆر سەیروسەمەرەی تێدا دەبزواندم. پێم وابوو یەکێکم لە گەڕیدە و دۆزەرەوە کۆنەکان و دوورگەیەکی ئەفسووناویم دۆزیوەتەوە کە هەموو درەختی مۆزە و من و ئەو کچۆڵەیەش، کە لە خۆمەوە پێم دەگوت «ئەوا»، لە ژێر سێبەری درەختەکاندا و لە نێو تۆڕە جۆلانەیەکی هەڵخراوی نێوان دوو داردا پێکەوە ڕاکشاوین.. کاتێک دەیویست گوزارشت لە شتێک بکات و بۆی نەدەهات، تووتییەکانی ئەو دوورگەیە لە جێی ئەو بەوشەی پچڕ پچڕ گوزارشتیان لە حەز و ئارەزوو و ویستەکانی «ئەوا» دەکرد و هەردەم چاوەڕێی ئەوە بووم کە بەبێ هۆ چاوەکانی پڕ بن لە فرمێسک و بگری.. ڕەنگە ئەو گریانەی زادەی یادەوەری ئەو ساتانە بێت کە لەسەر ئەسپە سپییەکە بەربۆوە، دەکرا شوێنەواری ئەو کەوتنەی لە

زامە قووڵە سارێژبووەکەی یووزی ڕاستیدا ببینیتەوە، گەرچی کە زۆر لێی ورد دەبوویتەوە زیاتر لە شوێن داغ دەچوو!؟

تەنها لە یەک دوو بۆنە و مەراسیمدا، ئەو کچۆڵەیەم بینییەوە کە بۆ خۆم ناوم لێ نابوو «نەوا»؛ بۆیە لە هەموو بۆنە و ئاهەنگ و مەراسیمە جۆراوجۆرەکانی شارەکەمدا ئامادە دەبووم، ئیدی دوور بەدوور هەموو ئەو کەسایەتییانەم ناسی کە بەردەوام لە بۆنە و ئاهەنگ و مەراسیمە هەمەچەشنەکاندا هەڵدەسان و بەپێی ڕۆژ وتار و قسە و نوکتەی هەمەچەشنیان پێشکەش دەکرد.. کەسایەتی پیاوە لێبووکەکە سەرنجی ڕاکێشام کە هەردەم بەجلک و شێوازی جۆراوجۆرەوە ئامادە دەبوو.. لە سەرەتای بۆنە و مەراسیمەکاندا هەڵدەسا وتارێکی دووردرێژی دەخوێندەوە و پاشان هێندە پێدەکەنی تا هەموو دەموچاوی دەبوو دوو ڕیز ددانی سپی گەورە کە ترسێکی سەیری لە دڵی ئامادەبوواندا دروست دەکرد و دەبوو چەپڵەیان بۆ لێ بدایە، ئەوەی لەو کاتەدا چەپڵە لێدانی لە یاد چووبایەتەوە یان هێواش چەپڵەی لێ بدایە؛ ئەوە پاش تەواوبوونی بۆنە یان مەراسیمەکە، کەسانێکی دەمامککراو شەو لە ماڵەوە دەیانبرد، هەندێک لەوانە ئیدی کەس نەیدەبینینەوە و ئەوانەی دەشگەڕانەوە هیچیان نەدەگوت و دوا بەدوای ئەوەش هەردەم لە بۆنە و مەراسیم و ئاهەنگەکاندا دەچوونە پێشی پێشەوە و بێ پسانەوە چەپڵەیان دەکوتی و هەندێکیان هەلهەلەیان دەکێشا و پیرەکانیشیان فێری سووڕدان دەبوون!؟

ساڵێک بەسەر مەرگی باپیرمدا تێپەڕی بوو، هێشتاکە چاویلکەکەم لە چاو نەکردبوو.. نەمدەویست خۆم بخەمە ژێر ڕەحمەت و نهێنی و تەلیسمی شتێکی نادیارەوە کە لەو چاویلکەیەدا شاردرابۆوە..

بەردەوام دەمویست هەڵبێم لەو وەهم و ئەو خورافانەی کە باپیرم لە بارەی ئەو چاویلکەیەوە بۆ من و بۆ خەڵکی باس کردبوو؛ کە بەردەوام بەشێوازی جۆراوجۆر بۆیان دەگێڕامەوە...

بەڵام هێندەی نەبرد پیرێژنە جادووگەرەکە بەرنامەی ژیانمی گۆڕی و من و چاویلکەکەی کردە دووانەی یەکدی.

شەوێکی درەنگ بەدەستێ جلی ئاڵ و دەست و پێی خەناوییەوە هاتە لام، مەمکە چرچ و لۆچەکانی تا نیوەی لە دەرەوە بوون و لێوەکانی ئاڵ کردبوو، ددانەکانی کەمێ ڕەش داگەڕابوون، جێگە خاڵێکی هەڵکەنراوی سەر ڕوومەتی ڕەش کردبۆوە و چاوە شینەکانی کل کردبوو.

سەرپۆشە سپییەکەی لادا و لەسەرمخۆ خەونێکی بۆ گێڕامەوە کە گوایا سێ شەوە دووبارە دەبێتەوە، خەونەکە زۆر تێکەڵ و پێکەڵ و سەیر و جۆراوجۆر بوو؛ زۆر لەوە دەترازا کە تەنها یەک خەون بێت.. تەنها لە یەک خاڵدا یەکی دەگرتەوە..

ئەویش ئامادەیی باپیرم بوو کە لە هەموو بەش و پارچەی خەونەکەیدا بوونی هەبوو...

لە بەشێکی خەونەکەی پیرێژندا:

(باپیرم پیرێژن دەخوازێت و بەسواری ماینێکی سپییەوە بەرەو مەملەکەتێکی تر دەبیات و دواجار لە ڕێگادا باپیرم لە لایەن چەند چەتە و ڕێگرێکەوە دەکوژرێت و پیرێژنیش دەڕفێندرێت).

لە جێگەیەکی تری خەونەکەی پیرێژندا:

(باپیرم هەژدە ژنی هەیە و هەریەکەیان ڕەنگ و شێوە و ڕوخساری

جیاوازیان هەیە، تەنانەت زمان و ڕەگەزیشیان جیایە و لە هەر هەموویان تەنها کوڕێکی بۆ دەمێنێتەوە...)

بەپێی قسەی پیرێژن:

( من لە ڕۆژگارێکدا دەبمە گەورەی ئەم شارە و لە زەمەنێکی داهاتووی پاش خۆشمدا وێنەی من لە جێگەیەکی گرنگی نێو شاردا دادەنرێت و نەوەیەک لە کوڕانی شار ناوی منیان لێ دەنرێت).

گرنگترین بەشێکی خەونەکەی پیرێژن:

(لە ڕۆژێکی باراناویدا پاش ئەوەی وەسیەتەکەی باپیرم جێبەجێ دەکەم و چاویلکەکەی لە چاو دەکەم، ئەو کچۆڵە ئەسمەرەی کە ناوم نابوو «نەوا»، شووم پێ دەکات و پاش چەند ساڵێک و بەڕێکەوت بەهۆی کەسێکی نزیکی ئەوەوە دەچمە نێو تۆڕێکی نهێنییەوە...

خێرا دەناسرێم و بەحوکمی تەلیسم و نهێنییەکانی چاویلکەکەشم زوو دەبمە کەسایەتییەکی ناودار و دواجاریش دەبمە گەورەی شار).

هێندە بێزار بووم لەو هەموو حیکایەت و سەرگوزشتانەی کە پیرێژن بەناوی خەونەوە بۆی گێڕابوومەوە، سەرباری ئەو بۆن و بەرامەیەی کە پیرێژن لەگەڵ خۆی هێنایە ژوور و تا دەشەهات زیادی دەکرد؛ قەدەرێک لە هۆش خۆم چووم...

کە بەئاگا هاتمەوە پیرێژن ژوورەکەی جێ هێشتبوو.. ئەوەی بووە جێگەی سەرنجیشم، ئەوە بوو کە بیجامەکەم لەبەردا نەبوو.. بەناوگەڵی ڕووتەوە ڕاکشابووم.. هەر چۆنێک بێت ئەو شەوە خەوتم و هەرکە بەیانی بۆوە، کۆمەڵێ کاغەزی بەچەشنی دوعا پێچراوم بینی، کە تێیدا نووسرابوو:

(وەسیەتەکەی باپیرت بەجێ بهێنە و چاویلکەکە لە چاو بکە.. بەڵام نەکەیت بەبێ ئەو بڕوانیتە هیچ شتێک).

ئیدی لەوە بەدواوە زیاتر نۆقرەم لەبەر بڕا، بەشێوەیەک کە پیشەکەی خۆشم وەک مامۆستایەک بۆ بەڕێوە نەدەچوو تا ئەو ڕادەیەی وانەکانم تێکەڵ دەکرد و زۆرجار خۆم و قوتابییەکانم لە پۆلدا دەخەوتین و دواتر خەونەکانمان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە و کێیان سەیروسەمەرەترین ببینیایە، چاکترین پلەم بۆ دادەنا.. لە تەمەنی خۆیان دەهاتنە پێش چاوم.. کوڕەکان بۆرتر و درێژتر دەردەکەوتن و کچەکانیش ئەگەرچی منداڵ بوون، بەڵام وام هەست دەکرد کە مەمکیان تا دێت گەورەتر دەبێت، تا ئەو ڕادەیەی کە زۆر جار بێ ئاگا دەستم بۆ دەبردن و دواتریش قوتابییە کوڕەکان لاسایییان دەکردمەوە، زۆر جاریش بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە باسی مێژووم بۆ دەکردن، لە باوەشی یەکتردا دادەنیشتن..

ئەم دیاردەیە لەو ڕۆژەوە لای قوتابییەکان بوو بەعادەت کە باسی ئەو سەردەمەم بۆ دەکردن کە خالید بن وەلید موسەیلەمەی کوشت... ئیدی لەگەڵ گێڕانەوەی سەرگوزشتەی هەر ڕووداوێکی مێژوویی شتی سەیروسەمەرەیان دەکرد، تا ئەو ڕۆژەی دارعەساکەی بەڕێوەبەرم لێ بەرزکردنەوە و گوتم:

(بەسە بەس.. ئێوە نازانن کە من گەورەترین گرفتم هەیە.. بەزەییەکتان پێمدا بێتەوە... تووشی گرفتێکی تریشم مەکەن.. باوکەکەم لەمەودوا بەئاقڵی دابنیشن، من تا ئێستا وەسیەتەکەی باپیرم بەجێ نەهێناوە.. من کەسێکی بێ کەڵکم.. بەدفەڕم.. بەدڕەوشتم.. من بەکەڵکی ئەوە نایەم هیچ فێری ئێوە بکەم، چونکە بۆ

خۆم هیچ نازانم.. ئەو قسانەی کە بۆتانی دەکەم، قسەی خۆم نین؛ قسەی ئەو پیرێژنە جادووگەرەیە!!؟.

باوەڕتان هەبێت دڵنیا نیم لەو وانانەی کە پێتانی دەڵێمەوە..)

هێشتاکە قسەکانم تەواو نەکردبوو کە بەڕێوەبەر بەشەلە شەل خۆی کرد بەژووردا و لە پشتمەوە ڕاوەستا.. درێژەم بەقسەکانم دا و گوتم:

(ئەگەر حەپسە خانی نەقیب نەبووایە، قوتابخانەی کچان نەدەکرایەوە، هەموو دەبێت لە ماڵەوە وێنەیەکی حەپسە خانی نەقیب هەڵبواسین، دەبێت بەوردی شارەزای مێژوو ببین و گشت نووسراوەکانی بخوێنینەوە).

بەڕێوەبەر دەستێکی بەپشتما هێنا و بەڕوویەکی گەشەوە گوتی:

(ئافەرین مامۆستا.. تۆ نموونەی ڕەوشت بەرزی و مایەی شانازیت بۆ قوتابخانەکەمان.. بەڵام خۆزیا وەسیەتەکەی باپیرت بەجێ هێنابا و چاویلکەکەت لە چاو کردبا.. بێگومانم کەسایەتیت دەگۆڕدرا.. یان ڕەنگە پلە و پایەشت گۆڕانی بەسەردا هاتبایە.. دوێنێ لە گۆڤارێکی ئینگلیزیدا، بابەتێکم لەسەر مۆزەخانەیەکی بەریتانی خوێندەوە کە تایبەتە بەمەدالیا و چەک و خەنجەر و کەلوپەلەکانی باپیرت، دیارە هەر هەمووی لەبەر ئازایەتی پێی بەخشرابوون.. بەخوا پیاوێکی نێر بوو...).

لەپڕ سێ پیاوی زرتە بۆز خۆیان کرد بەژووردا و قات لەبەرەکەیان ڕووی کردە بەڕێوەبەر و گوتی:

(کەس نەڕواتەوە، هەر ئێستا بەرەو گۆڕەپانی سەرەکی شار بکەونە ڕێ، بەم بۆنە مێژووییە گرنگەشەوە، ئەمساڵ پێنج پلە بۆ قوتابیان

دەخرێتە سەر کۆی پلەکانیان).

قوتابییەکان خۆیان پێچاپەوە پێش ئەوەی هەموومان پۆلەکە جێ بهێڵین، پیاوە قات لەبەرەکە وێنە هەڵواسراوەکەی سەر تەختەڕەشەکەی هێنایە خوارێ و تا هێزی تێدا بوو کێشای بەعەرد دا و شووشەکەی ورد و خاش بوو؛ دووانەکەی تر وێنەکەیان دەرهێنا و بەچەرخەکەی بەرێوەبەر گریان تێ بەردا و دواجار هەموو پێکەوە بۆ چەند ساتێک پێکەنین!! ئیدی لە گۆرەپانی سەرەکی شاردا، تێکەڵ بەئاپۆرەی قەرەباڵغی حەشامەتەکە بووین و لە ئەنجامی پاڵەپەستۆ و بگرە و بەردەدا من کەوتمە پێشی پێشەوە...

«ئەوا» یان ئەو کچۆڵەیەی کە من وام ناو لێ نابوو، کۆرکێڕی ئەو بۆنە مێژووییە گرنگە بوو.. بەردەوام وتاری حەماسی دەخوێندەوە و حەشامەتەکەش پاش تەواوبوون، یان زۆر جار پێش تەواوبوونی قسەکانیشی کە چاویلکەکەی باپیرم لەو قەرەباڵغییەدا لە گیرفانمدا نەشکێت. بێ هیچ مەبەستێک دەرم هێنا و کردمە چاوم...

سەرنجم دا هەمووان بەسەلکردنەوە و ڕێزێکی زۆرەوە تێیان دەڕوانیم.. یەک دوو پاسەوانیش هەروەک ئەوەی کە پاسەوانی تایبەتی خۆم بن.. دەوریان دابووم.. لە دڵی خۆمدا گوتم:

(ڕەنگە بەها و گرنگیی ئەو چاویلکەیە بزانن و بیانەوێت پارێزگاریم بکەن، تا کەس خۆم لێ نەدات).

شاگەشکە بووم بەو سیحر و تەلیسمەی کە چاویلکەکەم هەیبوو لەسەر سەرجەم ئامادەبووان.. سەرباری ئەوەی کە هیچ نیگەرانی و دوودڵییەکی ناوەکیم نەما.. لەو ڕۆژە مێژووییە گرنگەدا کە نەمدەزانی یادی چ ڕۆژ و ساڵ و بۆنەیەک بوو.. بەڵام لای من گرنگ ئەوە بوو کە

پاش ماوەیەکی زۆر لە سەرپێچی و ململانێ و شکاندنی وەسیەتەکەی باپیرم، لە ئێستادا بەسانایی وەسیەتەکەیم بەجێ گەیاند و خۆم خستە ژێر کاریگەری خورافاتی چاویلکەکەی باپیرم.

هێندەی نەبرد کچە ئەسمەرەکە یان با بڵێین ئەوەی کە من ناوم لێ نابوو، «ئەوا»، لە مایکرۆفۆنەکە نزیک بۆوە و بەکاوەخۆ گوتی:

(ئەی جەماوەری بەشەرەفی شارەکەمان، لەمڕۆدا بەبەڕێوەبەری نوێی شارەکەمان شاد دەبین کە دیارە بۆ خۆی کەسێکی ناودارە و لە بنەماڵەیەکی ناوداریشە... من وەک هاوسەری ئەو کەسە ناودارە، بەشانازییەوە ڕای دەگەیەنم کە ئەو ئامادەیە گیانفیدا بێت لە پێناو ئێوەدا و چی پێ بکرێت درێغی ناکات لە خزمەتی ئێوەی خۆشەویستدا.. دڵنیا بن لەوەی کە لەمەولا منداڵانتان پێخاوس نابن و سفرەی ماڵیشتان خاڵی نابێت.. ئەو پیاوە مەزنەی کە دەبێتە گەورەی شارەکەمان، زۆر لەوە گەورەترە کە من لێرەدا تاریفی بکەم.. ئێستاش داواکارم کە بۆ خۆی بێتە ئێرە و وتاری خۆیتان پێشکەش بکات).

دەنگی چەپڵە لێدان بەڕادەیەک بەرز بۆوە کە خەریک دەبوو کەڕ ببم، یان لە تاواندا لە هۆش خۆم بچم... پاسەوانەکان فەرموویان لێ کردم و کۆمەڵێ بەناو پیاوماقووڵ و نوێنەرانی ئەنجوومەنی شار و دکتۆر و پارێزەر... تاد، ئەملا و لایان ماچ کردم و بەبێ ویستی خۆم بردیانمە سەرەوە، هەرکە ڕووبەڕووی ئەو هەموو دەموچاوانە بوومەوە سامێک گرتمی و بەخۆمدا شکامەوە و غایەڵەی ئەوە لێی دام کە دەبێت چی ڕووی دابێت!؟

تۆ بڵێی قسەی جادووگەرەکە هاتبێتە دی، تۆ بڵێی ئەمە ئەو تەلیسم و نهێنی و بەنهانە بێت کە لە چاویلکەکەی باپیرمدا چەند ساڵە

حەشار دراوە...

گەڕامەوە بۆ نێو خەونەکەم و سەرەتاکەیم هاتەوە یاد، بەڵێ بەتەواوی ئەمە بوو کە ئێستا منی تێدام.. بەڵێ ئەو ئافرەتە ڕاست دەکات، بەپێی خەونەکە ژنی منە و منیش یەکێکم لە قارەمانەکانی ئەم شارە!

بێ ئاگا خەونەکەم بۆ ئامادەبووان و ئاپۆرەی جەماوەرەکە دەگێڕایەوە، کاتێکم زانی بوو بەدەف لێدان و تەهلیلە و زیکر...

گوتم:

(ئەوە چییە؟!)

ژنەکەم پێی گوتم:

(ئەوە لەبەرئەوەیە کە دڵنیا بوون لەوەی تۆ کەسێکی ئیماندار و نوورانیت و پێشتر کەرامەتت هەبووە و پێشبینی هەموو ئەم شتانەت کردووە).

حەزم بەو بەزمە نەبوو بەڵام لەبەرئەوەی وەسیەتەکەی باپیرم نەشکێنم گەڕامەوە بۆ نێو خەونەکەم و ئەو وتارەم بۆ خوێندنەوە کە لە سەرەتای خەونەکەدا بینیبووم.. بەدەنگێکی گڕ پێم گوتن:

(نامەوێت کەس سڵم لێ بکاتەوە و لێم بترسێت.. من تەنها لەبەر وەسیەتەکەی باپیرم، بۆ ماوەی بیست و چوار سەعات دەبمە گەورەی شار.. لە ماوەی ئەم بیست و چوار سەعاتەدا، دەبێت هەمووان بخەون و خەون بەشارێکی سپییەوە ببینن کە دەبێت وانەی مێژوو لە قوتابخانەکانیدا قەدەغە بکرێت و جوگرافیا جێگەی بگرێتەوە.. بێگومان دەبێت وانەکانی دیکەش دەستکاری بکرێن.. پێم باشە کتێبە

قەبارە گەورەکان گچکە بکرێنەوە و بکرێنە چەند لاپەڕەیەک چونکە زووربەی لاپەڕەکانی زیادەن و خوێندنەوەیان بێ سوودە).

کاتێک بەئاگا هاتمەوە، زانیم کە ئەمە وتاری خەونەکەم نییە، بەڵکو ئەمە دارشتنێک بوو کە پێشتر بۆ قوتابییەکانم نووسیبوو، خۆم تێک ئەدا و چوومەوە نێو خەونەکەم و دەقاودەقی وتارەکەم پێ گوتن:

(دەبێت وانەی مێژوو ببێتە وانەی سەرەکی و قەبارەی کتێبەکەی چوار هێندەی ئێستا بکرێت و هەموو وانەکانی دیکە پشتگوێ بخرێت!؟ چونکە ئێمە بێجگە لە مێژوو هیچ شتێکی دیکەمان نییە کە شانازی پێوە بکەین.. داواکارم مێژووی ماجەرا و سەرگوزشتەی باپیرم بکرێتە بەشێکی سەرەکی لە وانەی مێژوودا.. لە تاقیکردنەوەکانیشدا تەنیا ئەو بەشە بۆ قوتابیان بکرێتە پرسیار.. ئیدی لەمڕۆوە ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ نێو ژێرزەمینە تاریکەکانی مێژوو.. دەبێت جلوبەرگی ئەوان لەبەر بکەین و چەشنە خۆراکی ئەوانیش بخۆین، دەبێت پەیکەر بۆ باپیرم و هەژدە ژنەکەی لەم گۆڕەپانەدا دروست بکرێت).

هاڕەی چەپڵە لێدان مەستی کردم و گوێم لە بەرزبوونەوەی هوتافە سیحراوییەکان بوو، لە پاش لە چاوکردنی چاویلکەوە خەڵکیم بەبچووکی دەدی.. دەموچاوەکان بەشێواوی دەهاتنە بەرچاوم!؟

کۆمەڵێک گێرەشێوێن ویستیان قودسیەتی ئەو ڕۆژە گرنگە پێشێل بکەن، هەر بۆیە هەندێ ژاوە ژاو و دەنگە دەنگیان دروست کرد...

خێرا پاسەوانە تایبەتەکانم قۆڵبەستیان کردن و دووریان خستنەوە.. نازانم چۆن بوو لە مایکرۆفۆنەکەوە گوتم:

(دیارە هەموویان ئەو گێرەشێوێنانە دەناسن، ئەوان کەسانێکن ڕۆژنامە و بەیاننامەکانی خۆیان تەنها بۆ بڵاوکردنەوەی وێنەی خۆیان تەرخان کردووە، ڕەنگە لەو خاڵەشەوە ورووژا بن کە گوتم؛ پەیکەر بۆ باپیرم و هەژدە ژنەکەی دروست دەکەم... بەڵام دیارە ناکرێت ڕێگە بەوانیش بدەین کە پەیکەر بۆ خۆیان و ژنەکانیان دروست بکەن!؟ بەڵام دەکرێت تەنها لەبەر پارێزگاریکردن لە دیموکراتییەت و ئازادی، باخچەی گشتییان پێ ببەخشین، بۆ ئەوەی وێنەی خۆیان و خێزان و بنەماڵەکانیان لەوێدا بڵاو بکەنەوە و بیکەنە پێشانگایەکی تایبەت بەخۆیان، دیارە بەمەش دیاردەی وێنە بڵاوکردنەوە لە ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانیدا کەم دەبێتەوە و ئەو گرفتە دەروونییەشیان چارەسەر دەبێت).

ئیدی دەمزانی سەرەتای خەونەکەم تەواو بووە و لە نێوەڕاستیدام.. هەر بۆیە زیاد لە سەعاتێک لە چاوەڕوانیم مامەوە؛ تا بزانم چۆن چۆنی چاویلکەکەم دەشکێت.

سەیر لەوەدا بوو، هەموو ئەو حەشامەتە بەبێدەنگی ئەو سەعاتەیان ڕای کرد.. سەرباری ئەوەی کە هەروەک ئەوەی لە ماتەمینییەکدا بن، سەریان داخستبوو، لە کۆتاییی سەعاتەکەدا پیرێژنە جادووگەرەکەم بینی، لە نێوەڕاستی حەشامەتەکەدا خۆی ڕووت کردەوە و چوار پەنجەی کرد بەنێوگەڵیدا و پاشان دەستی کرد بەشاتە شات. تەواو حاڵی نەبووم چییان پێ دەڵێت و چییان بۆ باس دەکات... بەڵام هێندە دەزانم هێور هێور سەرنجی هەمووانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا و تەنها من و ژنەکەم بەتەنیا مابووینەوە.. هەر لەخۆڕا بەخۆمدا شکامەوە و چەشنێک لە نیگەرانییەکی سەرسووڕهێنەر دایگرتم، هەموو گیانم

شەڵاڵی ئارەق بوو.. فریای نەکەوتم.. چاویلکەکەم بەربۆوە و شکا!؟

هێندەم زانی حەشامەتەکە ڕوویان تێ کردم و کەوتمە ژێر پێیان.. هێندە پێلەقەیان لێ دام، تا لە هۆش خۆم چووم.

کە چاوم کردەوە پیرێژنە عەیارە جادووگەرەکە بەسەر سەرمەوە بوو...

بەدەنگێکی نووساو گوتی:

(جێگەی شەرمەزاریت بۆ باپیرت.. ئیدی تا تۆ لە ژیاندا بیت، ئەو لە گۆڕەکەیدا ناحەوێتەوە.. دەبێت بمریت).

گوێزانێکی لە جزدانەکەی دەرهێنا و پاش ئەوەی پانتۆڵەکەی لێ داکەندم.. قاقایەکی سەیری لێ بەرز بۆوە و بەدەستی ڕاستی پەلاماری نێوگەڵمی دا و بەدەستەکەی تریشی گوێزانەکەی لێ نزیک کردەوە...

پێش ئەوەی لە هۆش خۆم بچم، یان با بڵێین بمرم، چاویلکە شکاوەکەم بەسینگمەوە نووساند.. لە هاوێنەکانییەوە چاوەکانی باپیرم تێیان دەڕوانیم؛ بەڕادەیەک توورەییان لێ دەباری دەمزانی ئەگەر خۆی بمایە و ئاگای لەم دەرئەنجامەی من بووایە.. تا هێزی تێدا بووایە، تفێکی خەستی دەکردە نێو چاوانم و پێی دەگوتم:

(دەزانیت ئەم چاویلکەیەم بۆ دایتێ؛ تا کتێبە پیرۆزەکەی پێ بخوێنیتەوە و شتێک لە مێژوومان تێبگەیت!؟).

## لاپەڕە -٢١٥-ی کتێبێک

شتێکم سەبارەت بەسەفەر، لە لاپەڕە -٢١٥-ی کتێبێکی کۆندا بەرچاو کەوت.. کە زاتێکی گەڕیدە نووسیبووی. پاش خوێندنەوەی لاپەڕەکە، تەنها دوو وشە لە مێشکمدا چەسپ بوو، کە هێڵێکی بنەوشەیی بەژێردا هێنرابوو، کە لە پاڵ یەکدا و لە نێو کەوانەیەکدا نووسرابوو:

(زەمان و مەکان).

بەڵام هەموو ئەو سەفەرانەی کە من کردبووم، هیچ کات هەردوو وشەکەی لە یەک بازنەدا کۆ نەکردەوە و بەو پێیەش هەردەم هەستم بەلەنگییەک دەکرد.

نەمدەزانی چۆن چۆنی چەشن و شێوەی ئەو سەفەرە سەیروسەمەرەیەی خۆم بگێڕمەوە کە پێم وابوو، لە هەموویان سەیروسەمەرەتر بوو.

نەمدەزانی لە کوێوە دەست پێ بکەم.

هەموو ئەم دڵەڕاوکێ و پرسیارانە لە کاتێکدا بەمێشکمدا گوزەری دەکرد.. کە لە بەردەم چوار پێنج مایکرۆفۆنی گەورەی دەمێک ساڵ لەمەوپێشدا دانیشتبووم، گرامافۆنێک لە لایەکی هۆڵەکە گۆرانییەکی دەمێک ساڵ لەمەوپێشی پەخش دەکرد.

نەمدەزانی چۆن چۆنی گەیشتوومەتە ئێرە!!؟

چەند دەمڕوانییە نێو هۆڵەکە، حەشاماتێک بەبێدەنگی و حەپەساوی تێیان دەڕوانیم.

لەو دەمەدا سەعات (شەش) بوو.

ترس و خۆفێکی شاراوەی ناخم، ئارەقەیەکی سارد و ڕەشی پێ دەردەدام.

هەروەک ئەوەی کە پێشتر ئاگادار بوبێتم، بەئاماژەیەکی بەڕێوەبەری کۆڕەکە.. سەیری لاپەڕە بۆرەکەی بەردەمی خۆمم کرد و دەمم هەڵهێنا و گوتم:

(بەڕێزان.....!!؟)

گریانی منداڵێک کە نەمدەزانی لە کوێوە دەنگی دێت، بۆ ساتەوەختێک بێدەنگی کردم و پاشان گوتم:

(نازانم چۆن چۆنی باسی ئەو سەفەرەی خۆمتان بۆ بکەم... ڕەنگە لەو دەمەوە دەست پێ بکات.. کە چوومە نێو ئەو کەشتییە چارۆکەدارەی کە سێ و سێ ئالا جۆراوجۆرەکەی پێوە بوو.

سەرەتا کە چوومە نێو کەشتییەکە، هەستم بەوە دەکرد کە کات ئێوارە وەختێکی بنەوشەییە و ژمارەی کەسەکانی نێو کەشتییەکەش بەمنەوە دەبووە دوازدە کەس.

یەکێکیان، دکتۆر و دووانیان پیاوکوژ و ئەوانەی دیکەش بەتەواوی دیار نەبوو کە چ کارەن!؟

بەڵام ئەوە هەبوو، ڕیش سپییەکەیانم وەک کابرایەکی دیندار دەهاتە بەرچاو.

سەیروسەمەرەیی لەو ساتەوەختەوە دەستی پێ کرد کە بۆ ماوەیەکی زۆر ڕوانیمە ئاسمان و هەستم بەنەگۆڕانی ئەو ساتەوەختە بنەوشەییەی ئەو ئێوارەیە کرد، هەروەک ئەوەی ئاسمان بووبێتە وێنەیەکی فۆتۆگرافی نەگۆڕی ئەو ساتەوەختە. بەڵام کەشتییەکە دەجووڵا و هێور هێور شەپۆڵەکانی دەبڕی.. لە ساتەوەختی نغرۆبوونمان و بگرە و بەردەی تۆفانەکەشدا، وێنەی ئاسمان هەر نەگۆڕا.. لەو کاتەدا هێز و برستمان لێ برا و هەموو هیوایەکیشمان دوعا و نزای پیاوە دیندارەکە بوو.. ئەویش بەناچاری و هەر بۆ ئەوەی کە بەردەوام بێت، سەدان جار، هەمان دوعای دووبارە کردەوە و پێشم وابوو کە هەر ئەو دوعایە بزانێ.

ئیدی نازانم، پێش ئەوە ئەوانیش وەکو من خەوتن!!؟

یان بەتەنها هەر من خەوتم...)

کۆرکێرەکە بەرداخێک ئاوی دامێ..

سەیری سەعاتە هەڵواسراوەکەی لای دەستەچەپی هۆڵەکەم کرد، سەعات (شەش) بوو.

زارم هەڵهێنا و گوتم:

(بەرەبەیانێک خۆم لە دوورگەیەکی گچکەدا بینییەوە.. کە لە ژێر سێبەری پیرەدارێکدا ڕاکشابووم.. گەرچی کەنارەکە زۆر نزیک بوو

لەو شوێنەی کە منی لێ ڕاکشابووم.. بەڵام تا گەیشتمە کەنارەکە، نیوە ڕۆژێک بەڕێ چووبوو.

هەروەک ئەوەی کە هیچ کەشتییەکی چارۆکەدار، لەم کەنارەدا تێک نەشکابێت، هیچ پارچە و شوێنەوارێکی تێکشکاوی هیچ کەشتییەکم نەبینییەوە.

هەر هێندەی ڕیزە درەختەکانم تێپەڕ کرد و تۆزێ بۆ ناوەوەی دوورگەکە هەڵکشام.

ڕووبەڕووی دەرگا کۆنەکەی ماڵەکەی خۆمان بوومەوە.. بەنیازی دڵنیابوون، زیاتر لێی نزیک بوومەوە و دەرگاکەیم ترازاند و چوومە ژوور، هێشتاکە، پەردەکان.. سیسەم و جل و نوێن و مافوور و بەڕە داخراوەکانی سەر عەردی ژوورەکان و وێنە گەورە لە چوارچێوە گیراوەکەی باپیرم، لە ژوورە گەورەکەدا هەڵواسرابوو...

لە جێگە و شوێنی خۆیاندا و هەروەک ئەوەی کە کەس دەستی بۆ نەبردبێتن، مابوون....).

هەناسەیەکی قووڵم هەڵمژی و ڕوانیمە سەعاتەکە.. سەعات (شەش) بوو!؟ درێژمم دایە و گوتم:

(پاش ئەوەی ڕۆژانێکی دوورودرێژم لەو ماڵە کۆنەی خۆماندا بەتەنیا بردە سەر.. کەسانێک بەچاوبەستراوی بۆ ئێرەیان پەلکێش کردم).

چەند پرسیارێکی نووسراوم، لە کەسانێکەوە پێ گەیشت.. کە لە نێو هۆڵەکەدا دانیشتبوون، یەکێک لە پرسیارەکان باسی لەوە دەکرد کە گوایە من عومرێکی دوورودرێژم لەم هۆڵەدا بردۆتە سەر و ڕۆژانە لە هەمان سەعاتدا.. هەمان قسەکانی پێشوو دووبارە دەکەمەوە و لە

ڕاستیشدا و بەدرێژایی ژیانم.. لە دەرگای ئەم هۆڵەوە نەچوومەتە دەر، جا چ جای سنووری شار و سەفەرکردن!!؟

هێشتاکە لە خوێندنەوەی پرسیارەکە نەبیبوومەوە، کە کابرایەکی چوارشانەی ورگ زل، هەستایە سەرپێ و بەپەشۆکاوی و چەشنێک تووڕەبوونەوە... گوتی:

(بۆ خۆت دەزانیت، کە سەدان ساڵە سەفەر و هاتوچۆ بۆ دەرەوەی ئەم شارە قەدەغەیە... تەنها لە نێو دوو توێی کتێب و ئەم کۆڕ و قسانەی تۆوە، شتێک لە ماجەراکانی سەفەر حاڵی دەبین.. بەڵام چۆن دەبێت ئەم هەموو شتانەمان بۆ بگێڕیتەوە، لە کاتێکدا تۆش وەک ئێمەیت و هیچ کاتێک سەفەرت نەکردووە!!؟)

ڕووم کردە حەشاماتەکە و گوتم:

(سەعات چەندە؟!)

هەموو پێکەوە وەک پۆلێکی سەرەتایی وەڵامیان دامەوە و گوتیان:

(سەعات شەشە).

پاش یەک دوو جار پژمین، گوتم:

(لێرە هەموو کاتێک هەر سەعات شەشە).

هێدی هێدی و لەسەرەخۆ، خۆم گەیاندە بەردەرگای دەرەوەی هۆڵەکە و چوومە دەر....

پاشان بەپەلەپرووزێ دوور کەوتمەوە.

چەند جارێک، ئاوڕم لە پاش خۆم دایەوە و دوای دڵنیابوونم لەوەی کە هیچ کەسێک، وەدووم نەکەوتووە..

لە ژێر سێبەری پیرە دارێکدا، لێی ڕاکشام..

هەورە تەڵخەکانی ئاسمان، هێدی هێدی دەڕەوینەوە، پێم وانەبوو، کە جارێکی تر بتوانم... بچمەوە بۆ نێو هەمان هۆڵ و شتێک بۆ کەسانێک باس بکەم، کە وەک منن...

پاش شەکەتی و ماندووبوونێکی تەواو.. پێڵووەکانم لێک نا و پێش ئەوەی تەواو بچمە نێو خەونێکی قووڵەوە، کتێبی کەڕیدەکەم لە دەست بەربۆوە...

تەنها لاپەڕەیەکیش، کە لەو کتێبەدا خوێندبوومەوە...

لاپەڕە - ٢١٥ - بوو !!؟

## ئەستەمبوونی خەون لە بینیندا

پاش ئەوەی کە بەرێکەوت، خۆم لە ژێر گومەزێکی شووشەییدا بینییەوە، سەرەتا بەئاسایی هاتە بەرچاوم.. هەر لە پانتایی بێ کۆتای نێو گومەزەکە و چەشن و شێوەی ئەستێرەکانی ئاسمان و بۆنی مێخەک و بووخورد و گولاویش کە پێ دەچوو تایبەتمەندییەکی ئەو شوێنە بێت. جار جارە دەنگێکی ناسک، بەچەشنی شنەبایەک هەستی فێنکی و ئارامی تێدا دەبزواندم... ساکاری و سادەیی شوێنەکە، زیاتر مایەی دڵنیاییم و بێ دوودڵی ڕاکشام سەیرترین و نامۆترین ساتی ژیانم، ئەو دەمە بوو کە پێڵووەکانم لێک ترازان.. لە جێی گومەز و ئەستێرە و بۆنی مێخەک، خۆم لە جێگەیەکی دیکەدا بینییەوە.

هۆڵێکی فراوان و سپی، پەنجەرەیەکی گەورە دەیڕوانییە سەر دەریایەک و بەئاسانی نەوڕەسەکانت دەبینی تابلۆی کچۆڵەیەک کە لە نێو چاڵە قەبرێکدا ڕاکشابوو؛ بۆ تاوێک سەرنجی ڕاکێشام. ئینجانەیەک کە لەسەر مێزێک دانرابوو، گوڵێکی سەیری تێدا ڕوابوو..

نە تەواو بەگـــوڵی ڕاســـتی دەچـوو.. نە ئەوەش بوو، بەتەواوەتی لە گوڵی دەستکرد بچێت.

لەســـەر کـورسـیـیـەکی بەرز و درێژ ڕاکـشـابووم.. لەوەدا بوو کـە هەستمە سەرپێ، کاتێک کەسێکی بەتەمەن، لە بەردەممدا قووت بۆوە و بەدەسـتـەڕاسـتـی ئـامـاژەی بۆ سـەدرییـەکـەی بەری کـرد کـە لەسـەر گیرفانی سەرەوەی (دکتۆر) نووسرابوو.

پاش تاوێک ژنێکی پرچ سپی، بەدەنگێکی نەرم و نیان گـاز کـرد.. ژنە بەپەلە هاتە لای و بۆ تاوێک لە نێــو چاوی یەکـتــریـان ڕوانی.. دەمزانی باسی من دەکەن، بەڵام نەدەکرا هیچیان لێ حاڵی ببم.

پاش کەمێک، دکتۆرەکە بەتەباشیرێکی سوور کەوتە نووسین و سەر تا خواری تەختەڕەشە کۆنەکەی کە بۆ ئەو مەبەستە ئامادە کرابوو، ڕەش کردەوە.

بەسەرسامییەکەوە گوتم:

(تەواو لە دەسـتـخـەت و زمـانـی نووسـینەکـەتان حـاڵی نابم.. نازانم دەتانەوێت، چیم پێ بڵێن!!؟).

ژنە پرچ سـپـییـەکە، تەباشـیرەکەی لە دکتۆرەکە سـەند و بەخـەتێکی درشت و بەزمانێک کە دەکرا بیخوێنمەوە، نووسی:

(تۆ لە نێوان، هەموو خەوتن و هەڵسانەوەیەکدا!؟).

زۆر چاوەڕێم کرد، شتێکی تریش بنووسێت و چمکێکی وەزعەکەم بۆ ڕوون بێتـەوە، بەڵام هـیـچی دیکەی نەنووسی، بەقـوڕگـێکی گـیـراو و لەرزۆکەوە تەنها وشەیەکی لە زار هاتە دەر و گوتی:

(ئەو....)

لە دڵی خۆمدا گوتم:

(ئەو کێیە!؟).

پاشان هەر لە خۆمەوە، کەوتمە تەماشا و لێ وردبوونەوەی خاڵێکی ڕەشی نێو چەوانی دکتۆرەکە.

کە بەئاگا هاتمەوە، لە کەنار دەریایەکدا ڕاکشابووم.. گەرچی پاش هەوڵ و تەقەللایەکی زۆر، دکتۆرەکە قەناعەتی پێ کردم.. کە لە هەمان ژوورەکەی پێشوودام، گەرچی زۆر دڵنیا نەبووم لەوەی کە لەوێدا بم!؟

بەڵام نازانم بۆ گوتم:

(ئەو گوڵەی نێو ئینجانەکە، چەند جوانە).

ژنە پرچ سپییەکە بەخێرایی وەڵامی دامەوە و گوتی:

(بەڵام ئەمڕۆ ئینجانەکەمان لابردووە).

لەپڕ گوتم:

(ئەی تابلۆکە!؟).

دکتۆرەکە وەڵامی دامەوە و گوتی:

(هیچ کاتێک لەم ژوورەدا تابلۆمان هەڵنەواسیوە).

ساتەکانی منداڵی و ڕابردووی خۆمم، بەتەواوی وەبیر نەدەهاتەوە.. هەردەم وەک وێنەیەکی تەڵخ، دەهاتە پێش چاوم.

حاڵەتێکی سەیر بوو، پاش هەموو خەوتن و هەستانەوەیەک خۆم لە نێو ژیانێکی نوێ و جودادا، دەبینییەوە، خۆم لە شێوازێکی دیکەدا و لە جێگەیەکی نوێدا دەبینییەوە.. بەناوێکی جودا و کەسایەتییەکی نوێ و، ناچار دەبووم کە ژیان ببەمە سەر.

هەروەک چۆن، ئیش و کار و ناوم گۆڕانیان بەسەردا دەهات.. هەر ئاواش، ئیش و کار و ناوی کەسەکانی دەوروبەریشم، دەگۆڕا... هەنگاو هەنگاو، پێم وابوو کە لە شتێک نزیک دەبمەوە..

پاش تەواوبوونی، ڕێگە خۆڵاوییەکە.. شارۆچکەیەکی ڕووخاوم لێ وەدەر کەوت، هەر هەنگاوێکم، زیاتر نزیکی دەکردمەوە و ڕوونتر و ئاشکراتر، ماڵۆچکە ڕووخاو شوێن پردە دێرینەکانم دەبینی.

مێژوو مانایەکی سەیر و سیحراوی هەبوو.. ئێستای هەنگاوەکانی من و ڕابردووی ڕێگە و بەرد و دارە ڕزیوەکان، دەستەملانێی یەکدی دەبوون و شتێکیان دەدرکاند شتێک کە لە چەندەها وشە و دێر و خاڵ و فاریزە و نیشانەی سەرسووڕمان و پرسیار پێکهاتبوو.

شتێک کە ئەندێشە ئاسا، لە زەینمدا جێگەیەکی بۆ خۆی دەکردەوە، شتێک کە ئۆقرەی پێ نەدەگیرا و گینگڵی دەدا، شتێک کە نەدەکرا بیدرکێنم. حەوسەڵەی ژماردنی هەنگاوەکانم نەمابوو!!؟

دەمزانی ئەمەش چەشنێکە لە خەون و زۆر ناخایەنێت!؟

یەکەم ساتی ترازان و ونبوونم، لەو دەمەوە دەستی پێ کرد.. کە نزیک دەریاکە بوومەوە.. لەوێوە هەروەک ئەوەی کەسێک ڕێنومایيم بکات و ڕێگەم پیشان بدات، ئاوا بەرەو دارستانەکە کەوتمە ڕێ و لەوێدا و لە پاڵ دارێکدا و بەدەر لە ویستی خۆم پێڵووەکانم لێک نا.

هەموو ئەو کەسانەم، دەهاتە پێش چاو.. کە پێشتر ناسیبوومن و لەگەڵیاندا ژیابووم، تەنانەت مردووەکانیش!؟

گەرچی منیان نەدەناسییەوە.. بەڵام دواتر و بێ ئاگایانە، ڕۆڵی هەمان ئەو کەسانەیان دەبینی کە پێشتر ناسیومن.

بۆ جارێکی دیکە کە لە ژووری دکتۆرەکەدا، بەئاگا هاتم ژوورەکەی تەواو لە گۆرەپانی تۆپ تۆپێن دەچوو.. دوو گۆڵی بەرامبەر بەیەک و تۆپێک لە ناوەڕاستدا.. دکتۆریش، جلی حەکەمی لەبەر کردبوو..

گەرچی بێجگە لە دکتۆرەکە کەسی ترم نەدەبینی.. بەلام هەروەک ئەوەی یارییەکی ڕاستەقینە بێت.. دکتۆر جار جارە فیکەی لێ دەدا و ناو بەناویش کارتی زەرد و سووری دەردەهێنا،... پاش تەواوبوونی یارییەکە گوتم:

(ئاگام لە هەموو یارییەکە نەبوو).

دکتۆر بەزەردەخەنەیەکی پڕ ماناوە تێی ڕوانیم و گوتی:

(یاری چی!؟)

بەئس و بێهوودەیی لەو ساتەوەختەدا، تەنگیان پێ هەڵچنیم و بۆ تاوێک ڕوانیمە گۆشەیەکی ژوورەکە و پاشان بەتیلەی چاو تەماشای دکتۆرەکەم کرد..

ئەویش لە نێو دەفتەرێکی کۆندا، وێنەیەکی دەرهێنا و پیشانی دام و گوتی:

(بیرت دێت، پێش پازدە ساڵ لەمەوپێش. لە باڵیۆزخانەی - ؟ - ئەم وێنەمان پێکەوە گرت).

زارم هەڵهێنا و گوتم:

(من ماوەیەکی کەمە دێمە عیادەکەتان و ناشێت لەو زەمانەدا یەکترمان ناسیبێت).

دکتۆرەکە زۆر بەباوەڕ بەخۆبوونەوە گوتی:

(بەلام ئەوەی کە دەیبینی حەقیقەتە، ئەم حاڵەتە دەروونییەت بووە

ڕێگر لە بەردەم جێبەجێکردنی کارە نهێنییەکەدا .. جا پێش ئەوەی (ئەو) بەتەواوی تووڕە و کەڵلەیی بێت، دەبێت کارەکە بەئەنجام بگەیەنیت).

دکتۆرەکە دەمانچەیەکی لە چەکمەجەی مێزەکەی هێنایە دەر و بەدووڵییەکەوە، دایە دەستم.

لەسەرەخۆ لێم پرسی:

(چی بکەم؟!)

پاش تاوێک بێدەنگی و هەناسەهەڵکێشانێکی قووڵ، گوتی:

(لە پاش ئەم سانەوەختەوە، خۆ گێلکردن فریات ناکەوێت.. یان ئەوەتا، پاش بیست و چوار سەعات ئەوەی کە پێت ڕاسپێردراوە.. بەئەنجامی دەگەیەنیت، یاخود!!).

هیچم نەگوت.

پاش ڕامـــان و وردبوونەوەم لە پەڵە هەورە ڕەش و تووڕەکـــان.. هێندەی تر، زەینم کوێر بۆوە و ئەوەی دەشمزانی لە یادم چۆوە.. زۆر بەخێرایی سانەکان بەهەدەر دەچوون و زیاتر ئەو دەنگە ئاشنایەم وەبیر دەکەوتەوە.. کە دەیگوت:

(دەبێت بیکوژیت)

لەبەرخۆمەوە بەردەوام، ئەو دێرەم دووبارە دەکردەوە و دەمگوت:

(کێ بکوژم).

هەروەک ئەوەی کە دکتۆرەکە هەر لە نزیکمەوە بووبێت و ئاگای لە هەموو شتێک بێت، بۆ دواجار گەیشتە لام و هێمنی کردمەوە و لەسەرەخۆ گوتی:

(دڵنیـا بە لەوەی کـە جـارێکی تر بێـزارت ناکـەین.. - ئـەو - ئـیدی هیچی لە تۆ ناوێت).

لەوەدا بوو کە بپرسم: (لەمەودوا بۆم هەیە ئازادانە خەون ببینم).

دکتۆرەکە، هێدی و لەسـەرەخۆ دەمـانچەکەی لە دەست دەرهێنام و پاش ئەوەی چوار هەنگاو، لە من دوورکەوتەوە...

گەیشتمە ئەو یەقینەی کە ئەستەمە جارێکی تر، خەون ببینم!!؟

# ئەو جگەرە تەڕانەی کە نەمانکێشا

بوولێڵی ئێوارەیەکی ساردوسڕ بوو؛ ئەو دەمەی کە من و ئەو هەوڵی کێشانی ئەو جگەرە تەڕانەمان دەدا کە لە نێو قوتوویەکی ژەنگاویدا دانرابوون، هێندە تەڕ بوون کە بەئەستەم دانە دانەی جگەرەکانمان بۆ بەرز دەکرایەوە... هەموو جارێک پێش ئەوەی کە تووتنی نێو کاغەزی پێچراوی جگەرەکە ئاگر بگرێت، لە نێوەڕاستەوە دەشکا...

پاش سەعاتێک سەری قوتووە ژەنگاوییەکەمان داخست کە پێ دەچوو چەندی جگەرە لێ دەربهێنیت، هێندەی بچێتەوە جێ.

بەکۆڵانێکی پێچاوپێچی تەسک و ترووسکدا هەڵگەڕاین و پێش ئەوەی بگەینە کۆتایی کۆڵانەکە.. سەرێکم هەڵبڕی و ڕوانیمە دەموچاوی ئەو.. هێشتاکە بەتەواوی لێی ورد نەببوومەوە کە گوێم لە دەنگی دوو ئافرەتی بەتەمەن بوو، بەزمانی خەڵکانی ئەو وڵاتە دەدوان کە دەمێک ساڵ بوو جێم هێشتبوو...

هەردووکیان ڕەشپۆش بوون و لە بەردەم دەرگایەکی گەورە ڕاوەستابوون...

پاش ئەوەی پێنج شەش هەنگاوێک لەو ناوە دوور کەوتینەوە، ئەو گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی کە دوو ئافرەتەکەی لێ ڕاوەستابوون بەناچاری وەدووی کەوتم و بەبێ ئەوەی بەخۆمان بزانین، هەردووکمان چووینە نێو کۆشکێکی گەورەوە.. پاش ماوەیەک چووینە نێو ئەو هۆڵەی کە کابرایەکی کەڵەگەتی ڕەشتاڵەی تێدا بوو.. بەدەم شەرابخواردنەوە دەمیروانییە ئەو کچۆڵە گەنجانەی کە سەمایان دەکرد.. ئەو دەستی بۆ میوەیەکی قەبارە گەورە و سەیری نێو قاپێکی زیوینی سەر یەکێک لە مێزەکانی نێو هۆڵەکە برد و پێش ئەوەی بیگەیەنێتە دەمی لە نێو پەنجەکانیدا، وەک تەمێکی سپی لێ هات و پاشان نەما...

بەکاوەخۆ یەکە یەکەی ژوورە ڕازاوە و جوانەکانی نێو کۆشکەکە گەڕاین... چیت ویستبا لە کەلوپەلی سەیر و شتی دانسقە و عەجایب لە نێو سووچ و پەنای ژوورە ڕەنگاوڕەنگەکانی کۆشکەکەدا بەدیت دەکرد!؟

پاسەوانە تایبەتییەکانی کابرا ڕەشتاڵەکەشت لە دالان و ڕاڕەو و پەنا دیوار و نزیک دەرگا و هەموو سووچ و گۆشەیەکی دەرەوەی ژوورە داخراوەکاندا دەبینی.

هەموو شتێک ئاسایی بوو تا ئەو کاتەی کە ئەو دەستی بۆ قوتووە ژەنگاوییەکە برد بێجگە لە کۆمەڵێک جگەرەی تەڕ هیچ شتێکی تری تێدا نەبوو.

پاسەوانی تایبەتی پشت دیواری ئەو ژوورەی کە قوتووە ژەنگاوییەکەی تێدا بوو، ئێمەی بەدی کرد و هێندەی کە هەوا لە سییەکانیدا بوو، فیکەیەکی توند و درێژی کێشا...

لە حەژمەتا بەپەیژەیەکی نێو ژوورەکەدا هەڵگەڕاین و چووینە نێو نهۆمێکی تری کۆشکەکە.. دواتریش بەپەلە بەقادرمەیەکی دوورودرێژدا ڕامانکردە سەرێ و خۆمان لە سەربانێکی کاشیکراودا بینییەوە.

هەموو پاسەوانەکان چواردەوریان گرتین و بۆ سەعات و نیوێک یان ڕەنگە زیاتریش پێکەوە چاوەڕێی کابرا ڕەشتاڵەکەمان کرد کە کابرای ڕەشتاڵە بەخنەخن و هانکە هانک هاتە سەر و لە نێوەڕاستی پاسەوانەکانەوە و وەکو ئەوان، کەوتە لێ وردبوونەوە و تێڕوانینمان.. پاش کەمێک ئینجا هەستم بەوە کرد کە هەر هەموویان نەک تەنها هێندەی یەکتر ڕدێنیان هێشتۆتەوە بەڵکو شێوەشیان کتومت لەیەک دەچێت.

بەبێدەنگی کۆکەی کەسێکی بەتەمەن و ئیختیار لە خوارەوەی ئەو قادرمەیەوە هات کە دەهاتە سەربانەکە.. پێنج شەش پاسەوان بەپیریەوە چوون پاش پێشوازی لێکردنی بەقادرمەکاندا چوونە خوارێ و هێندەی نەبرد ستاندێکی لە تەختە دروستکراوی زۆر گەورە و قورس و کامێرایەکی مۆدێل کۆنیان هێنایە سەرێ و پاش دامەزراندنی ستاندەکە و ڕاگیرکردنی کامێراکە لە سەری.. کابرا بەتەمەن و ئیختیارەکە چووە پشت کامێراکە و وێنەیەکی بەکۆمەڵی گرتین کە بێجگە لە من و ئەو هەر هەموویان بەیەک شێوە وەستابوون...

دواتر من و ئەویان بردە پەنایەک و سندووقە ژەنگاوییەکەیان دایە دەستی ئەو، پاش وەرچەرخاندنی ڕووی کامێراکە بەکاوەخۆ وێنەیەکی گرتین.

گەرچی وا چاوەڕێ بووین هەر پاش تەواوبوونی وێنەگرتنەکە، بەقادرمەکەندا بمانبەنە خوارێ و لە شوێنێکی نادیاری کۆشکەکەدا

زیندانیمـان بکەن.. بەڵام سەیر لەوەدا بوو کە گوریسێکی درێژ و قەویان لە نێوقەدمان بەست و بەڕاکێش ڕاکێش و بگرە و بەردە و هەوڵ و تەقەللای هەموویان، لە سەربانی کۆشکەکەوە بەرەو خوار شۆڕیان کردینەوە.. هەرکە پێمان کەوتە سەر عەردی کۆڵانەکە، زۆر بەئاسانی گوریسەکەمان لە نێوقەدمان کردەوە و تا پێمان کرا هەڵهاتین!؟

بوولێڵی ئێوارەیەکی سارد بوو، ئەو دەمەی کە بردیانینە نێو ئەو ژوورەی کە موحەقیقە پیرەکەی تێدا بوو؛ پرسی:

(باشە بۆ چوونە نێو ئەو کۆشکە مێژووییەوە؟ خۆ تا ئێستا کەس جورئەتی نەبووە هەر بەلاشیدا بڕوات.. باشە مەبەستتان چی بوو؟ ناکرێت هەر بۆ خۆشی و لەخۆڕا چووبێتنە نێو ئەو کۆشکەی کە هەموو مێژووی ئێمەی تێدا پارێزراوە؟!).

باش تاوێک کە زانی هیچ وەڵامێکی نادەینەوە، بەنابەدڵییەکەوە هەستایە سەرپێ و چووە بەردەم تاقە پەنجەرەیەکی نێو ژوورەکە کە بەبۆیەیەکی مەیلەو سوور، سەر بەرەو خوار تا نیوەی بۆیە کرابوو.

سەرێکم هەڵبڕی و بەچەشنێک ڕوانیمە دەموچاوی ئەو کە هەر دەتگوت بۆ یەکەم جارە تێی بڕوانم و سەرنجی چرچ و لۆچی دەموچاوە شێواوەکەی بدەم.. لەوەدا بوو بەئامـاژەکردن شتێکی پێ بڵێم؛ گەرچی دڵنیاش نەبووم لەوەی کە دەمەوێت چی پێ بڵێم! پیرە موحەقیق قوتوویەکی سەر ئاوەڵای ژەنگاوی لە بەردەمماندا دانا کە کۆمەڵێک جگەرەی تەڕی تێدا بوو.

من و ئەو لەوەدا بووین، دەست بخەینە نێو قوتووە ژەنگاوییەکەوە، کاتێک گوتی:

(دەستی لێ مەدەن، دەزانم مەبەستتان بووە ئەو قوتووە سیحرییە بدزن کە چەند جگەرەی لێ دەربهێنرێت ژمارەی جگەرەکانی هەروەک خۆی دەمێنێتەوە).

من و ئەو لە پەنایەکی ژوورەکەدا تا بەیانی نەخەوتین و هەر چاوەڕێی فرسەتێک بووین کە پیرە موحەقیق لێمان خافڵ بێت؛ بۆ ساتێکیش بێت پێڵووەکانی لێک بنێت و بخەوێت.. تا سەر و جگەرەیەکی نێو قوتووە ژەنگاوییەکە دەربهێنین.

گەرچی دەشمانزانی کە پێش ئەوەی تووتنی نێو کاغەزی پێچراوی جگەرەکە ئاگر بگرێت، لە نێوەڕاستەوە دەشکێت!؟

ئەو بێ باکانە دەمی هەڵهێنا و گوتی:

( ئەستەمە بتوانین گەر بۆ تەنها جارێکیش بێت؛ تەنها جگەرەیەکی نێو قوتووە ژەنگاوییەکە بکێشین).

# حەکایەتی هەڵئاوسانی کیسە ئاوییەکان

لە نێوەڕاستی کەنارێکدا ڕاوەستابووم؛ هەروەک ئەوەی لە کۆنە فیلمێکی ڕەش و سپی بڕوانم... بێ پەتی.. بەکراسێکی ئاودامانی سپییەوە؛ دەمڕوانییە شەپۆلە ڕەش و سپییەکانی دەریاکە، کەشتییە چارۆکەدارەکان.. هێدی هێدی شەپۆلەکانیان دەبڕی...

ئەوڕەسە هەڵکورماوەکان.. هەروەک ئەوەی مۆمیا کرابێتن!!؟ لە شتێکیان دەڕوانی؛ شتێک کە دەمێک ساڵ بوو، لە هەناومدا ئۆقرەی گرتبوو.

ئاوڕم دایەوە و ڕوانیمە ئەو کورسییەی کە لە ئێسک دروست کرابوو، ئێسکەکان تا بڵێی قەوی و تۆکمە بوون... بەشی دواوەی کورسییەکەش، لە عاج دروست کرابوو.

ئاوێنەیەکی لاکێشەیی گەورە؛ یەک دوو مەتر لە پشتەوەی کورسییەکەوە دانرابوو.

پێم وابوو، پێشتر ئەم وێنانە لە سات و وەختێکی دیکەی خەونێکی

پێشووەمدا.. بینیبێت... هێندەی وەبیرم دەهاتەوە.. نەورەسەکان؛ وەک ئەو بەلەمە کاغەزانەی کە بەمنداڵی دروستم دەکردن.. سەر ئاو دەکەوتن... کورسییەکە؛ بنیادەمێکی درێژی لەسەر دادەنیشت!!؟

ئاوێنەکەش؛ هەردەم وێنەی کەسێکی نەخۆشی پیشان دەدا... کەشتییە چارۆکەدارەکان؛ لە خاڵێکی وەستاوی تەماشامدا، دەبوونە هەڵم و لە بەرچاوان ون دەبوون.

لەبەر خۆمەوە گوتم:

(ڕەنگە هێشتاکە بەتەواوی بێدار نەبووبێتمەوە؟! یان تۆ بڵێی هەردوو خەونەکە، تەنها یەک خەون بێت و من لێم بووبێتە دوو خەونی جودا!؟...).

نەورەسەکان، بێ ئەوەی ببزوێن و بجووڵێن.. دەیانڕوانییە ئەو شتەی کە لە ناخمدا هەڵدەئاوسا.

شتێک کە هەرگیز لێم جیا نەدەبۆوە و جێی نەدەهێشتم!؟

بەکاومخۆ ئاوڕێکی دواوەم دایەوە، جووتێ پۆستاڵی ڕەشی بێ قەیتان؛ لەسەر کورسییەکە دانرابوو..

ئاوێنە لاکێشەییەکەی پشتەوەی کورسییەکەش؛ دە هێندەی خۆم، گەورە بووبوو... بنیادەمێکی پێ پەتی، لەودیوەوە لە منی دەڕوانی؛ ڕووکاری لە مامۆستای زیندەوەرزانیمان دەچوو.. بۆ یەکەم جار حەکایەتی کیسە ئاوییەکانم لەوەوە بیستبوو.. ساڵێکی ڕەبەق، باسی ژیانی سەیروسەمەرە و سووڕی گەشەکردنی و گەورەبوونی ئەو بوونەوەرە عەجایەبانەی بۆ کردین... لەبەر خۆمەوە گوتم:

(بەڵام بۆ دەبێت، گەیشتبێتە ئێرە؟!)

دەمویست بەلایەکدا ببزوێم و چنگەکانم لە لی کەنارەکە گیر بکەم و مشتێک لم بدەم بەئاوێنەکەدا؛ تا لە بوونی ئاوێنەکە، یان وێنەکە.. حاڵی بم!؟...

سەرێکم هەڵبڕی و ڕوانیمە جووتە پۆستاڵەکەی سەر کورسییەکە، لە جێی خۆیدا نەمابوو.

نەمدەزانی کەی و چۆن لە پێم کردبوو، نیو بەنیو لە لمەکە ڕۆ چووبوو.. ڕەشاوێکی لێ دەهاتە دەر و لمەکەی بەچەشنی ئاوەڕۆی دێراوێک ڕادەدێرا...

لەو دەمەدا هەروەک ئەوەی یەکێک شتێکم بەگوێدا بچرپێنێت و پێم بڵێت:

(سەر هەڵبڕە...)

هێشتاکە هەمان وێنەی پێشوو.. لە ئاوێنەکەوە تێی دەڕوانیم... بەدەستەڕاستی ئاماژەی بۆ وێنەی ئەو کیسە ئاوییانە دەکرد کە لەسەر ئاوێنەکە کێشابوونی!؟

تا ئەو دەمەش، کورسییەکە کەسی لەسەر دانەنیشتبوو... لەوەدا بوو بەخۆمدا بچمەوە و شتێک بڵێم؛ گوێم لە دەنگی هاوارێک بوو...

هەروەک ئەوەی تیزابیان بەچاوەکانمدا کردبێت، لەپڕ بەرچاوم ڕەش داگەڕا و بۆ ئاوێک لە هۆش خۆم چووم.. لەو دەمەشەوە ئیدی؛ هیچم نەدەبینی!؟

پاش هەڕوەڵەکردنێکی کەمخایەن؛ کەسانێک کە نەمدەبینین لە بەردەممدا، یەک لە دوای یەک ڕاوەستان و گیرسانەوە، یەکێکیان بەلەقە، ئاوێنەکەی پشت کورسییەکەی شکاند.. هاڕە و دەنگی

بەربوونەوەی پارچەکانی، گوێیەکانی کاس کردم.. پاش تاوێک، بەئیقاعێکی سەربازی و لەسەرەخۆ چۆوە نێو ڕیزبەندییەکەی پێشووی کەسە ڕاوەستاوەکان. بۆ تاوێک لە بێدەنگییەکی قووڵدا، جێیان هێشتم...

نازانم بۆ تاقیکردنەوەی زیندەوەرزانی ئەو ساڵە تەڕ و تووشەم وەبیر هاتەوە...

پرسیارەکان تایبەت بوون بەکیسە ئاوییەکان؟! پاش هەفتەیەک لە تاقیکردنەوەی زیندەوەرزانی.. لە ڕۆژێکی ساردوسڕدا، مامۆستا بەتووڕەییەوە خۆی کرد بەژووردا و پاش ئەوەی سەرکۆنەیەکی زۆری هەموومانی کرد، هەڵوێستەیەکی بۆ کرد، ڕووی کردە من و گوتی:

(باشترین پلە تۆ بەدەستت هێنا).

دەنگێک بەئاگای هێنامەوە، بێ سێ و دوو چوومە سەر کورسییەکە و دانیشتم.

بۆ دواجار گوێم لە شەپۆل و هۆڕ و هاڕەی دەریاکە بوو؛ بەشێوەیەک کە تا ئەو دەمە هاڕەی لەو چەشنەم نەبیستبوو.

پۆستاڵەکانی پێم بۆ پێشەوە خزا!؟.

گوێم لێ بوو، یەکێکیان گوتی:

(پۆستاڵەکانی تاکە و تاکن).

چواردەستە بەرزیان کردمەوە و نزیک دەریاکە جێیان هێشتم هێندەی نەبرد شەپۆلە سوێرەکانی دەریاکە؛ بەتەواوی تەڕیان کردم، دواتریش لە لووت و دەممەوە ڕۆچوونە نێو بۆشاییەکانی هەناوم، پاش تاوێکیش کیسە ئاوییەکانیان هەڵئاوساند.

نەورەسەکان لەو دەمەدا لە شتێکیان دەڕوانی، شتێک کە دەمێک ساڵ بوو لە هەناومدا ئۆقرەی گرتبوو.

شەپۆلەکان، گەمەیان بەمووەکانی سنگم دەکرد!

هێندە کەنەفت و بڕست لێ بڕاو بووم، پێم نەدەکرا ڕاچەنێم و لە دوا بەش و کۆتاییی خەونەکە هەڵبێم.

چەندم حەز دەکرد پێم کرابا و بمتوانیبایە بڵێم:

(ئەوەی کە دەیبینم، تەنها ساتەوەختێکی تاڵ و سوێری خەونێکی بەسەرچووە!!؟). یان پڕ بەدەم هاوارم بکردایە و بمگوتایە: (ئەوەی کە دەیبینم، تەنها حەکایەتی هەڵئاوسانی کیسە ئاوییەکانی هەناوێکی وێرانە!!؟).

## پێخەفێک لە خوێن

دڵۆپە خوێنەکان وەک ساڵانی تەمەن لە قووڵاییی زامێکی کۆنەوە دروست دەبوون و بەبێدەنگی بەردەبوونەوە.. لە بەشی سەرەوەی ژوورێکی تەڵخدا، خوێنی لێ دەڕژیشت.. دوورشکێکی ڕەش بەمردوویی لە دوو توێی کتێبێکی زەرددا خەوتبوو.. دڵۆپە خوێنەکان لەسەر عەردەکە ڕێچکەیان دەبەست و دەبوونە چنگێکی ڕەش و بەسەر شووشەی پەنجەرەکاندا هەڵدەزنان، بەرەو پانکە کۆنینەکە خۆیان دەکوتا و هێندەی تر ڕەشیان دەکرد.. قرژاڵێک لە نێو بلووری چرایەکدا بەبێدەنگی خەوتبوو.

گەرما ژوورە لیخنەکەی فوو دەدا و بینایی لێڵ دەکرد، هەموو شتێکی نێو ژوورەکە ئارەقەی دەردەدا؛ تەنها پێخەفەکە نەبێت. بەبێ وەستان خوێنی لێ دەچۆڕا. ئەو پێخەفەی کە لە هەوەڵی تەمەنیدا شینێکی کاڵ بوو، پاشان بووە عەبایەکی ڕەش و ئێستاش وەک خاکی کوشتارگەیەک دێتە پێش چاو. سیگارێکم لە چای وشک پێچایەوە و کێشام.

دووکەڵ و هەڵم و گەرما، بەهەموو لایەکدا خۆیان دەکوتی و تەنها نزیکی پێخەفەکە نەدەبوونەوە، ئەو پێخەفەی کە پێش سەعاتێک هێنرایە ئێرە و بەرانبەر بەمانەوەشی ئەم پەساپۆرتەیان دامێ؛ بەڵام بۆم نەبوو لە جێی خۆم بجووڵێمەوە و تێی بڕوانم، تەنانەت بۆشم نەبوو لێیان بپرسم، چییە و بۆ دەیهێننە لای من، بۆنێکی سەیر لە پێخەفەکە دەهات و سەری وەگێژ دەهێنام و لە دەریاچەی خەونێکی ئەفسووناوی نزیکی دەکردمەوە، بەڵام نەدەبوو پێڵووەکانم لێک بنێم و بخەوم. ئەو پیاوەی کە لە بەراز دەچوو، پێی گوتم:

(تا ئەم پێخەفە لێرەدا بێت، تۆ بۆت نییە بخەویت، بۆت نییە بدوێیت، بۆت نییە دەرگا و پەنجەرە بکەیتەوە.. بۆت نییە هەناسە بدەیت؛ نەبادا پێخەفەکە بەئاگا بێت...).

ئەوە بۆ دوو ساڵ دەچێت من لەم ژوورەدا دەگوزەرێم، پاش هەڵهاتنم بە زۆر کارەوە خۆم سەرقاڵ کرد و دواجار بوومە تەزویرچی و ژوورەکەشم کردە کاروانسەرای موسافیرەکان و بەردەبازێک بۆ پەڕینەوە، بەڵام تا ئێستا هیچ پێخەفێک بەمیوانی لە ژوورەکەمدا نەمابۆوە.

ڕوانیمە ئاوێنە تەڵخەکە و گەمەم بەمووە ڕەشە لوولبووەکانی سنگم کرد و هێڵنجم دا.. ڕووکارم زەرد و هەڵبزڕکا و لە ئاوێنەکەدا وەدیار دەکەوت و بالاشم هێندەی درێژی شوێن جێگای هەنگاوی دڵۆپە خوێنەکان سێبەری دەدا.. قرژاڵەکەم لە نێو بلووری چراکە دەرهێنا و دامگیرساند.. کوژایەوە.. یەک دوو جاری دیکەش پێم کرد و هەر کوژایەوە.. پێ دەچوو بوونەوەرێک هەموو ئۆکسجینی ژوورەکەی هەڵمژیبێت!!؟ لەبەر خۆوە گوتم:

(تۆ بڵێی ئەم پێخەفە خوێناوییە هەناسە بدات!؟).

بابۆڵەکەی نیوەڕۆم لە زارم نزیک کردەوە و ڕشامەوە.. نەمدەتوانی بابۆڵەیەکی خوێناوی بخۆم، کتێبە زەردەکەم لەسەر عەردەکە هەڵگرتەوە و بێ باکانە پەڕەکانیم لێک جودا کردەوە.. دووپشکە ڕەشەکە خوێنی لێ دەچۆڕا، وشەکانم بەسووری دەدیت، پەراوێز و پێچ و پەنای کتێبەکەش دەبووە پارچە گۆشتێکی خوێناوی.. کتێبەکەم تووڕ هەڵدا و بەرەو دەرگاکە هەنگاوم نا، لە دەرەوەڕا کلۆم درابوو؛ تەنها من و پێخەفێک و تاریکاییی ژوورێک، ئامبازی یەکدی ببووین.. دەبوو میز و پیساییش لە نێو تەنەکەیەکی ژەنگاویدا بکەم، خەیاڵ و ئەندێشەم وەک ئەختەبووت؛ تەنها نێچیرە زامدارەکانیان دەبینی ورکێکی سووریش لە پەنجەکانمەوە دادەچۆڕا.. کەفێکی ڕەش لە زارمەوە ڕێچکەی بەستبوو، بێ هەست و خوست دەجووڵامەوە، نەبادا پێخەفەکە بەئاگا بێت و لە بەردەم ئەو گەورە پیاوانەدا شەرمەزار ببم و ڕیسەکەم لێ ببێتەوە بەخوری...

لە ناخەوە بەخۆمدا شکامەوە و کاڵتەم بەخۆم هات.. چۆن پێخەف بەئاگا دێت، یان چۆن هەناسە دەدات!؟ مەحاڵە گەر شەیتانیش بێت، لە جێی خۆی ببزوێت.. ئەی ئەو دڵۆپە خوێنانە چییە کە پەیتا پەیتا پانتاییی عەردی ژوورەکە داگیر دەکەن، تا قولەپێم هەر خوێنە، سەیرە هیچ مرۆڤێک هێندەی خوێن تێدا نییە... بەڵام وێ دەچێت ئەم پێخەفە لە ڕێی دەریاوە ئاودیو بکەن!؟

نەدەبوو ئەم پرسیارە لە مێشکمدا گەرا دابنێت و سندووقە سەرم بتەنێت.. لە کاتێکدا تەنها کرمۆکەی ڕەشتاڵەی تێدا دەژی و هیچ پنتکێکی سپی تێدا بەدی ناکرێت!؟

لە هەمـوو ئەو ئەندێشـە و خـەیاڵاتە هەڵهـاتم و بەدەنگە ناوازەکـەم گۆرانییـەکی بێ تامم چڕی؛ دەبوو لە نێو دەنگێکدا خۆم لە پێخـەف و شـوێن پەنجـەی پەڵە خـوێنەکـان بشـارمـەوە و چیدی نەڕوانمە ئەو شـتـانەی کـە ڕەنگیـان دەگـۆڕێت، لایـتـێکی گـەورەم داگیـرسـاند و ژوورەکـەم وەک کـەشـتـیـیـەکی تێکشکاو هاتە بەرچاو کـە هێندەی نەمابێت نغرۆ ببێت. دەنووکیان خوێنی لێ دەچۆڕا، چاوەکانیان وردە لی لێ دەباری، ئەوان شـتـێکیـان دەزانـی و من نەمـدەزانـی؛ ئەمـڕۆ نهێنییـەک لەم ژوورەدا منی کردۆتە پاسـەوان و دەرگاکەشـی لەسـەر کلۆم داوم.

تیـشکێک دەرەوەی ڕووناک کـردەوە و قـاتە ڕەشـەکـەی باوکم بینی، لەبەری ژنێکی ورگندا بـوو.. بەتەواوی سـنگی خـسـتـبـووە بەر با و مەمکەکانی لەسەرە قـاژووی سەربڕاو دەچوون، لەقلەقێک بەبەردەمیدا گـوزەری کـرد و پاشـان تەنهـا دەریا و تیـشکی لایتی کـەشـتی و پاپۆڕەکان سەرنجیان ڕاکێشام و دواجار بوونە پێخـەفێک کە بەهەموو لاکـاندا، گـەورە و درێژ دەبۆوە، تا ئەو حـەلەی بەر شـووشـەی پەنجـەرەکەم کەوت و بوومەلەرزە ئاسا ناخمیـان هەژاند و ئاووهەوای دەریا و شـێداری شـەو و بۆنی قەوزە و ماسـییە گەنیوەکانیان هێنایە ژوور و دوو پەیکەرە ئێسکی ماسـیش کە بەبەردەکەوە هەڵواسرابوون کەوتنە جووڵە.

هەموو شتێک؛ لەو ژوورەدا دەنگی دەهات و جار جارە دەبووە زەنگی کـڵێـسـایەک و هەندێ کـاتیش ئاژێری پاپۆڕێکی دوور، دواجـاریش بەلوورەیەکی سامناک و درێژخـایەن کۆتـایی دەهات و پاشان ژوورەکە دەچۆوە نێو پانتاییەکانی بێدەنگی.

هەستم بەخنکان دەکرد!؟

هەر بۆیە قەوزەکانم لە خۆم دوور خستنەوە و جلکە تەڕبۆوەکانیشم داکەند و بەڕووتی بەشوێن بەرگێکی نوێدا دەگەڕام، تا بیپۆشم.. بەشوێن سیگارێکدا دەگەڕام تا بیکێشم.. نەمدەزانی دەگریم یان پێدەکەنم.. لەگەڵ ئەو چنگە خوێناوییانە بەشەڕ هاتم کە بست بەبستی ژوورەکەم دەگەڕان.. پەلێکی قرژاڵەکەم شکاند و بلووری چراکەشم خستە نێو تەنەکە ژەنگاوییەکە، هاوار و ناڵەی دەریایەکی تووڕەم پێ بوو، بەڵام وەک ئەوەی دوعایەکی تەلیسماوی زارمی بەستبێت، نەمدەتوانی پڕ بەگەرووم هاوار بکەم و ئەو شەیتانە بەئاگا بێنم و ببینم، بزانم چییە و کێیە.. چ کارێکی بەمن هەیە و دەیەوێت بگاتە کوێ!؟ ئیفلیجی میرروولە ئاسا بەجەستە و بەدەنمدا هەڵدەزنا، ماسوولکەکانم تا دەهات ڕەقتر دەبوون و جەستەشم هێندەی قورسایی خنکاوێک قورس ببوو.. هاوارم کرد، بەڵێ هاوارم کرد:

(تۆ کێی ئەی ئەو شەیتانەی کە کاوێژی خوێن دەکەیت و خوێن هەڵدێنیتەوە.. هەڵسەرە سەرێ و تێم بڕوانە، چونکە ناتوانم تێت بڕوانم.. هەستە و لەگەڵمدا بدوێ، چونکە ناتوانم بتدوێنم..).

بێدەنگی وەک تەونی جاڵجاڵۆکە هەموو کون و قوژبنێکی ژوورەکەی تەنی و چاوەڕێیش پەپوولە دەنگێک بوو...

چرپە و سرتە لە هیچ شتێک نەدەهات و پێ دەچوو، هەموو شتەکان پێکەوە سوێندیان خواردبێت کە چرپەیان لێوە نەیەت؛ تەنانەت کاتژمێرە کچکەکەی گیرفانیشم میلەکانی لە جووڵە کەوتن و وەستان، بێ ئاگا لەسەر مێزێکی گەورەی نزیک پەنجەرەکە ڕاوەستابووم.. نەمدەزانی بۆ گەیشتوومەتە ئەوێ، بەڵام بەهەرحاڵ کەنەفتی و

شەکەتی هێندەیان شالاو بۆ هێنام، هێندەیان شالاو بۆ هێنام، تا بەچۆکدا هاتم و لە ناوەڕاستی مێزەکەدا گرمۆڵە بووم.. دەشمزانی نەدەبوو بخەوم، بەلام نەمدەزانی بۆ نەدەبوو بخەوم!؟

ژوورێکی کڵۆمدراوی دووره دەست و پێخەفێکی خەوتوو.. ئەو لە لایەکی ژوورەکەیە و منیش لە لایەکی دی، ئەو لە قووڵایی خەودایە و منیش بێدار پاسی دەکەم.

گیزە گیزی مێشێک؛ ئەو دەنگە ئەفسوناوییە بوو کە بەهانامەوە هاتبوو، تا لە نێو ئەو زەلکاوی بێدەنگی و تەنیاییەدا دەرمکێشێت... ئیتر لەو ساتەوە هەستم دەکرد، یەکێکی دیش هەیە ئاگای لە پێخەفەکە بێت.

نەدەبوو بخەوم.. دەمزانی نابێت بخەوم، بەلام گەر نەخەوم ڕەنگە ئۆکسجینی ئەم ژوورە تا بەیانی بەشم نەکات و بخنکێم؛ بەلام هەر نەدەبوو بخەوم؟!

[ئەو پشت کۆمە قەمبوورەی کە دەمێک بوو دەیروانییە تێکچڕژان و ئامبازبوونی دوو ڕەگەزی جیاواز، دوو ڕەنگی چاوی جودا، پاش ئەوەی سەدەیەک یەکتریان هێنا و برد، قەمبووری ڕەشتاڵە لە فرسەتێکدا خەنجەرێکی لە پشتی کچی پاشای یەکێک لە ڕەگەزەکان دا و: ئەو کچۆڵەیەی کوشت کە بیست ساڵ بوو دەریا لە چاوەکانیدا خەوتبوو].

دەمێک بوو، ئەم ڕووداوەم لە کتێبە زەردەکەدا خوێندبۆوە، نازانم بۆ لە نێوان خەو و بێداریدا هاتەوە یادم.. لە نێو کەژاوەیەکی سوورەوە، کچۆڵەیەکی زەرد وەک خۆرەتاو و چاوشین وەک دەریا، وەدەرکەوت و قامکەکانی گرتم و پێ بەپێی ئەو هەنگاوم نا.. سمۆرەیەک لە نێو

قەفەزێکدا مردبوو.. باڵندەیەک هێلکەی خۆی دەخوارد.. لە نێو لوولپێچ و پێچ و پەنای فنجانێکدا شارێک وەدەرکەوت.. مرۆڤە هەزارەکان پەیکەری ئێسک بوون و دەوڵەمەندەکانیش کەماڵە سەگی پیر و پەککەوتە، لە بەردەم درەختێکی چوارگۆشەدا شوێن خەنجەرەکەی پیشان دام و سەرنجی ئەو دڵۆپە خوێنانەم دا کە لێی دەچۆڕا، پێی گوتم:

(نەدەبوو بخەویت، هەر لەگەڵ خەوتنی تۆ، من بەئاگام و چیدی ناخەومەوە).

هێندەی گوت و لەپڕ لێم بووە پیرێژنێکی سەد ساڵەی عەیار:

(- سێ هەزار ساڵ لە ئەشکەوتی ولاتێکدا خەوتم و نەمدەویست بەئاگا بێم، بەلام قەمبوورێک بەبیست و چوار سەعات منی لەوێوە گەیاندە ئێرە!؟

- تۆ کێی؟

- هەر کێیەک بم، تازە زامەکەم سارێژ نابێت و بەردەوام خوێنی لێ دەچۆڕێ.. ئەو زامەی کە پاش سێ هەزار ساڵ کولایەوە...).

پاش کەمێک لەبەر خۆمەوە گوتم:

(بەتەنیا چوومە نێو ئەشکەوتێکی سپییەوە و شارێکی ئەفسووناویم بەدی کرد.. دەستت بۆ هەر چییەک دەبرد، دەبووە خۆڵ و دادەباری؛ تەنها جەستەی مۆمیاکراوێک نەبێت، کە پێ دەچوو لەو ساتەدا مردبێت یان خەوتبێت). هەرکە پێڵووەکانم لێک ترازاند، زنجیرەی پانتۆڵەکەم کردەوە و میزێکی خوێناویم ڕۆکردە نێو ئەو گۆمە خوێنەی کە تا سەر مێزەکەش هەڵکشابوو.. پاش خەونێکی ئەفسووناوی تەواو

پەشۆکابووم، بەپەردەکە ئارەقەی دەموچاوە سوورەکەم سڕیەوە و ڕوانیمە ئەو دەریایەی کە ڕەنگی خوێنی گرتبوو، کەشتییەکان یەکپارچە خوێن و چارۆکەکانیش پەڵە خوێنی ڕەش بۆوە.

زێدەتر چنگە خوێناوییەکان خۆیان دەکوتی، دەرگاکە دیار نەمابوو.. تەواو بەسوورایی سواغ درابوو، شووشەی پەنجەرەکە وەک سکرینی سینەمایەک تەواو سوور هەڵدەگەڕا و جار ناجارێکیش چەند پەڵە ڕۆشناییەک دەبوونە پردی پێکەوە گرێدانی دەریا و نیگاکانم.. چەند هەوڵم دا پەنجەرەکە بشکێنم؛ بەلام بۆم نەشکا و بێهوودە، ماندوو و کەنەفت لەسەر مێزەکە بەچیچکانەوە دانیشتم.. ڕوانیمە پانکە کۆنینەکە کە بەهێواشی هەڵدەسووڕا و لە جێگا زامێکی شوێن خەنجەر و خوێنێکی گەرم؛ بەڵێ منیش وەک هەموو شتێکی دیکەی ژوورەکە بریندار بووم و خوێن لە جەستەم دەچۆڕا.. لەقلەقێک لە پەنجەرەکەوە تێی دەڕوانیم و باڵە خوێناوییەکانی نیشان دەدام.. پەیکەرە ئێسکی ماسییە هەڵواسراوەکانی سەر پەردەکەش خوێنیان لێ دەچۆڕا و دەلەرینەوە، وەک ئەوەی گیانیان بەبەردا هاتبێتەوە و بیانەوێت لە مەرگ هەڵبێن!؟

هەستم بەتین و تاوی گەرمایییەک دەکرد کە لە گەرووەمدا کینگڵی دەدا.. دەستم بۆ دەمم برد و یەکە یەکەی ددانەکانم بەربوونەوە و پاشان دوو پەڵە خوێنی گەورە وەک ئیسفەنجێکی لیخن بەدەستمەوە هاتن.

چاوەکانم خوێنیان تێ زا و چووزانەوە.. بینایم لێڵ بوو، تاریک بوو.. پاشان سوور داگەڕا و ئیدی هیچم نەدی. بۆنی خوێن مەرگەساتی کچۆڵەیەکیان وەبیر دەهێنامەوە، پاش ئەوەی بوو بەژێر

ئۆتۆمـبـێلەوە، وەک کـەڵەک سـەر بەرەو خـوار بەدار هەنجـیـرێکدا هەڵیانواسی و سێ شەو و سێ ڕۆژ خوێنی لێ چۆڕا و پاشـان دە چار کفنیان کرد و هەر شاڵاوی خوێن نەگیرسایەوە.

دەنگێک لە ناخـمـەوە زایەڵە و سـەدایەکی سـەیری هەبوو (نەدەبوو بخەویت!؟)...

ڕاستە نەدەبوو بخەوم، بەڵام نەمدەزانی بۆ نەدەبوو بخـەوم!؟ تاوێک بەپێـوە خـەوتم و دواتر بەترسـەوە پێـڵـووەکـانی چاوم لێک ترازان و ڕوانیمە شووشەی پەنجـەرەکە و هیچ پەڵە خـوێنێکم نەدیتەوە.. بەڵێ خـوێن بەرەو کـونۆچکە و قـوڕنە و سـووچ و کـەلەبەری ژوورەکـە هەڵدەکشـا و ئاودیو دەبوو... دیوار و دەرگـا و پانکە ڕەنگی خوێنیـان لێ دەوەری و بۆر دەبوون، کتێبە زەردەکە وەک خۆی بوو.. قرژاڵەکەش لە قوڕنەیەکدا خەوتبوو.

دەستم بۆ شوێن زامەکەی پشتم برد و هـیچ دیار نەبوو.. لە کاتێکدا کە پەیتا پەیتا ئارەقەیەکی سوێرم دەردەدا، لە پەنجـەرەکەوە ڕوانیمـە دەر.. دەریا لەو سـاتەوەخـتـەدا وەک ئـامـانە مـسـێکی مـەیلەو شین دەینواند و بێدەنگ ڕاکشابوو.

بەرەو پێخـەفەکە هەنگاوم نا و لەوەدا بوو پەتۆکە هەڵبدەمەوە و بزانم ئەو شەیتانە خەوتووە کێیە؟!

دەرگاکە کرایەوە و پیاوە دەموچاو بەرازەکە هاتە ژوورێ و ڕووی تێ کردم و بەدەنگێکی زیقن پێی گوتم:

(- بەخـێرایی خـۆت بگەیەنەرە ئەو بەلەمەی کـە لە قەراغ ئـاوەکەدا ڕاوەستاوە

– بەڵام ئەی پێخەفەکە؟!

– ....!!؟).

وەک جەستەیەکی مۆمیاکراو چوومە نێو بەلەمەکە و پیاوە دەموچاو بەرازەکە ئاماژەی بۆ خاوەنی بەلەمەکە کرد و کەوتە سەوڵ لێدان، کەنارمان جێ هێشت و کەوتینە نێو دنیا بێ کۆتاییەکەی سەفەر.. بەڵام من تەنها چاوم بڕیبووە ئەو ژوورەی کە دوو ساڵی تەمەنم تێدا بەسەر بردبوو.

دەمویست بزانم چی ڕوو دەدات؟!

پاش تاوێک پەردەکان دادرانەوە و دەرگاکەش هەر بەکڵۆمدراوی مایەوە، ئەو لەقلەقەش کە نهێنی پێخەفەکەی لابوو، لەسەر پەیکەری کەشتییەکی شکاوەوە تێی دەڕوانیم.. تا مەودای نێوان من و ژوورەکە زێدەتر دەبوو، چڕتر دەمڕوانییە ئەو ژوورەی کە ئارەقەیەکی شینی دەردەدا و تا دەهات وەک دەستی خنکاوێک زیاتر ڕۆ دەچوو.

نهێنییەک لەوێدا بوو، چیدی نایبینمەوە!؟ پێش ئەوەی ژوورەکە تەواو لە بەرچاوم ون بێت، دیمەنێکی سەیر سەرنجی ڕاکێشام؛ ژوورەکە تا دەهات بەکاوەخۆ وەک باڵەخانەیەک بەئاسماندا دەچوو.. هەروەک ئەوەی بیەوێت شتێکم پێ بڵێت، یان نهێنییەکی تازەم لا بدرکێنێت.. هێندە بەرز بۆوە تا بۆ دواجار بالآیم بینی، باڵای سێ هەزار خرکە بەرد، باڵای شینبۆشێکی تەڕ بوو و تێکەڵ بەلم؛ پێخەفێک لە خوێن!؟.

## نیو هەنگاو بۆ تێپەڕکردنی سنوورێک

نازانم کیسەڵ بوو، یان خوودەیەکی سەربازی.. ئەوەندە دەزانم لە چەقی ڕێگایەکی خۆڵاویدا بێدەنگ ئۆقرەی گرتبوو.. هێندە بەسام بوو.. نەمدەتوانی هەڵوکێڕی بکەم و لەبنڕا لە ناوەخنەکەی تێبگەم.. ئەو مێشانەی کە تێی وردوکابوون، هێندە گەورە بوون.. پێ دەچوو لە ناوەخنی ئەو شتەدا، خۆراکێکی تایبەتی هەبێت و ئەمانی خەنی کردبێت!؟ نازانم چەند تێم ڕوانی، بەڵام دواجار هەموو هەوڵدان و کۆششەکانم بۆ تێپەڕکردنی سنووری گیزە گیزیان بەناکامی گەیشت.. لە نێو پانتاییەکانی خۆڵبارانلدا، چاوەڕێی شتێک بووم، یان ڕەنگە چاوەڕێی هیچ نەبوویم!؟

هێندەی نەبرد خۆڵ، خوودەکە یا کیسەڵەکەی داپۆشی و شوێن پێی تەنها کەسێک کە بەوێدا گوزەری کردبوو، ون بوو. دەریایەک لە شەپۆڵەکانی خۆڵ، بەئاسماندا مەلەیان دەکرد و هێدی هێدی هەموو شتێکیان دادەپۆشی. تەنها من نەبێت کە هەردەم و بەردەوام پێم بەسەر خۆڵەکەوە بوو.

دەبوو قسە لەگەڵ سەرۆکدا بکەم، گوێم لە دەنگی بوو:

(باش ئەوەی تۆم کردە پاڵەوان، بۆت نییە بکشێیتەوە و تەنانەت یەک هەنگاویش بێیتە دواوە...).

نازانم بۆ تەواو، باوەڕم بەقسەی ئەو پیاوە هەبوو، هەردەم گوێشم لە دەنگی بوو، بەردەوامیش شێوە و ئاکاریم لە گشت شتێکدا بەدی دەکرد.. تەنانەت لە نێو ئەو خۆڵبارانەشدا، کە لە خۆم زیاتر کەسم نەدەدی! بەڵام وام هەست دەکرد کە ئەو لە نزیکەوە ئاگای لە من بێت و چاودێریم بکات. بەدرێژاییی سالانی جەنگ، یەک دڵۆپە خوێنم بەدی نەکرد و هەردەم و دەسبەجێ خۆڵێکی ڕەش زامەکانی دادەپۆشی و جەستە ڕاکشاوەکانیشی دەشاردەوە.

جفرەیەکی سەرۆکم پێ کەیشت و خێرا دەستم دایە ئەلبوومەکە و هەمــوو وێنەکــانم ســووتاند.. نازانم بۆ دەمویست هیچ وێنەیەکی لە ئەلبوومەکەدا نەمێنێت؟! تەنها وێنەیەکم هێشتەوە کە نەمدەناسی و نەشمدەزانی کێ خستوویەتە نێو ئەلبوومەکەم، نازانم بۆ وام هەست دەکرد، کە ڕەنگە وێنەی ئەو کچۆڵە ڕووکار زەردە بێت، کە پێش شەش مــانگ لەمــەوپێش لە جێگا و شــوێنێکدا، کــە تەواو لە یادم نەمــاوە بەدیارمەوە دەگریا.. کە جلکە سەربازییەکانیان سووتاندم، تەنها ئەو دەگریا.. کە پۆستاڵەکەشمیان لە بەرمیلێکی ژەنگاوی هاویشت، نازانم کێ بوو، دەیلووراند، ڕەنگە ئەو سەگە بووبێت، کە بەمندالّی بەرماوەی خۆراکم بۆ ڕۆ دەکرد..

ڕەنگە هەر لەو ڕۆژەوە دنیام جێ هێشتبێت، یان ڕەنگە پاش ئەوە بووبێت.. بەهەرحاڵ، هەرچۆنێک بێت و بووبێت، من دنیام جێ هێشت و هەر دەشبوو جێی بهێڵم.

کە لە ئۆتۆمبێلە خۆڵاوییەکە دابەزیم و ساختمانە سپییەکەم بینی، نەمدەویست بچمە ژوورەوە، هێشتاکە قسەکانی سەرۆک لە مێشکمدا دەزرنگایەوە:

(هەر جێگە و شوێنێک، نیشانە یان ئارمی خاچی پێوە بوو، بەمردوویتیش خۆتیان تەسلیم نەکەیت و نەچیتە ژوورەوە!؟).

سەیر لەوەدا بوو، ساختمانەکە بۆ خۆی خاچێکی گەورە بوو.. پەتۆکەم فڕێ دا و سوێندم بەسەری سەرۆک خوارد کە ناچمە ژوورێ.. هەردوو پیاوە نەیارەکە بزەیان هاتێ، ڕەنگە ئەوان سەرۆک نەناسن، یان ڕەنگە سەرۆک لای ئەمان نکوڵی لە ناسینی من کردبێت!!؟ یەکێک لە پیاوە نەیارەکان پێی گوتم:

(با بەترسنۆکت نەزانن، تۆ پاڵەوانیت و دەبێت سڵ لە چوونە ژوورەوە نەکەیتەوە).

وەک پاڵەوانێک ڕاوەستام و لە نێو مەودای ساختمان و مەدالیاکانی سنگمدا، هەستم بەئامادەبوونی حەشاماتێکی گەورە دەکرد.. کە وێنەی منی پاڵەوانیان بەرز کردبۆوە و ژمارەیەکی زۆریشیان چەپڵەیان دەکوتی.. جار جارەش گوێم لە دەنگ و نووزەی کچۆڵەیەک دەبوو، کە نەمدەزانی لە چ جێگە و شوێنێکدایە و بۆ کێش دەگری؟!.

دار و دیوار پێداهەڵدانی پاڵەوان بوو. تەنها لە یەک لافیتەدا، بەهەڵە نووسرابوو (شەهیدی پاڵەوان) هەر زوو پێچایانەوە و هەڵگرەکەشیان دەستگیر کرد!؟ گەرچی پێم ناخۆش نەبوو، بەڵام نازانم بۆ شێلگیرتر بووم، کە نەچمە ژوور و یەک دوو شەقم هاویشت و یەک دوو جوێنی تەڕیشم لە زار بەربۆوە.. پاڵەوان بۆی هەبوو، هەموو شتێک بکات!!؟

ژمارەیەک لە پیاوماقوولان، لە نێو ساختمانەکەوە دەریەڕین و مەدالیاکانیان لێ کردمەوە و بەزۆر جلەکانیان لەبەر داکەندم و پۆستاڵەکانیشیان توور هەڵدام...

هەر چوار پەلیان ڕاکێشام و زۆر بەسانایی بردمیانە ژوور لەسەر پەتۆیەکی ڕەش باڵیان خستم و لە نێو ناونیشان و ژمارە سەیروسەمەرەکانی ژوورەکاندا، سەرم وەگێژ چوو.. گوێم لە دەنگێک بوو، فەرمانی کرد:

(ژووری سفر). لە دڵی خۆمدا گوتم:

(بەڵام بۆ ژووری یەخچاڵ، خۆ هێشتاکە نەمردووم!؟) پێ دەچوو لە وشە نەگوتراوەکانیش بگەن، هەر بۆیە ئاراستەی ڕۆشتنیان گۆڕی و بەرەو ژووری ٢/١ هەنگاویان نا کە لەوێدا تەنها پەلەکان دەبڕدرانەوە.. بەڵام هەرچۆنێک بێت، لە ژووری یەخچاڵ باشتر بوو!؟

گەرچی تەنها زامێکی گچکە لە لاقی ڕاستمدا هەبوو، بەڵام بەپێی پلانی تیمی نێو ساختمانەکە، دەبوو لاقێکم هەر ببڕن.. دەیانزانی پاڵەوانێکی وەک من، بەیەک لاق ناتوانێت بجەنگێت!؟

شەو درەنگان سستەرێک هاتە لام و باسی ئەو شارۆچکەیەی بۆ کردم، کە پیاوەکانی هەموو بێ لاقن و شەقامەکانیش لە جێی ئۆتۆمبێل تەنها کورسییە بەپێچکەکانی ئەوانی تێدا هاتوچۆ دەکات.

پاشان بەدەنگێکی نزم و لەسەرەخۆ، پێی گوتم:

(دەبێ خۆشحاڵ بیت، کە هەردوو لاقیان نەبڕیتەوە.. ڕەنگە لە جێگەیەکی تری ئەم دنیایەدا وڵاتێک هەبێت بۆ بێ قاچەکان و پێ دەچێ ئیش و کاریشیان تەنها تێڕوانینی فیلمی منداڵان بێت).

هێشتاکە جلە سەربازییەکانم تەواو نەسووتابوو، کە سەرۆک بەتەلەفۆن پەیوەندی پێوە کردم و پێی گوتم:

(چاوەڕێتین)

دەمزانی بەبێ من هیچیان پێ ناکرێت!

تازە من ئەو ئەفسانەیە بووم، کە گرەوی جەنگی پێ دەبرایەوە.. بەخێرایی تاکێ پۆستاڵیان کردە ملم، بۆ جارێکی تریش مەدالیاکان سنگمیان ڕازاندەوە و لە لایەن حەشامەتێکیشەوە، بەچەپڵەڕێزان بەڕێ کرام.

سەربازەکان وەک خۆیان بوون، شتێک کە گۆڕدرابوو، کەمبوونەوەی ژمارەی لاقەکان و زیادبوونی ژمارەی دارشەقەکان بوو!؟

بەلاَم سەرباری ئەوەش هەموو شتێک ئاسایی بوو، هێشتاکە خوێنی هیچ سەربازێک نەڕژابوو.

نیوەشەو سەرۆک گەیشتە لام و بۆ یەکەم جاربوو بەپەشۆکاوی بیبینم پێی گوتم:

(تا ئێستاکە نەمهێشتووە، دڵۆپێک خوێن برژێت.. کەچی ڕۆژنامە و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، ئەم جەنگە بەخۆڵەپەتانێ ناو دەبەن.. سەروو خۆم داوای جەنگێکی خوێناویم لێ دەکەن و منیش نە پێم خۆشە و نە دەشتوانم خوێن ببینم، هەر بۆیە پێش ئەوەی بگەمە لات، لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، دەست لە کارکێشانەوەی خۆم بەڕەسمی ڕاگەیاند و ئێستاش تەنها دەتوانم یەک کاژێر لات بمێنمەوە و دواتر بەرەو ساختمانی خاچەکە بەڕێ دەکەوم.. پێم خۆشە، ئەمشەو دوا هێرش و دوا لاپەڕەی پاڵەوانیی خۆت بۆ مێژوو تۆمار بکەیت.. بەلاَم

نابێت لە فەرمانم دەربچیت و ڕازی نیم، تەنانەت دڵۆپە خوێنێکیش بڕژێت).

چادرەکانمان پێچایەوە و بۆ یەکەم جار لە بەردەم سەربازەکاندا ڕاوەستام و پێم گوتن:

(سەرۆک لە بۆردوومانێکی دوژمندا، هەر چوار پەلی لە دەست دا و ئێستاش بۆ چارەسەر بەرەو وڵاتێکی دی گوێزرایەوە.. دەبێ ئێمەش لە تۆڵەی ئەو مەزنە، هێرشێکی بەرفراوان بەرینە سەر دوژمن و ئاگاداریشتان دەکەم، کە ڕێگە بەبەکارهێنانی هەموو شێوازەکانی جەنگ دراوە، تەنها ئەو شێوازانە نەبێت کە دەبێتە مایەی خوێن ڕشتن).

لە ئێستادا تەنها ساتەکانی دەستپێکردنی هێرشەکەم لە بیرە و ساتەکانی تەواوبوونیم لە یاد نییە، یان ڕەنگە هێشتاکە هەر نەوەستابێت.

بەدرێژایی هێرشەکە دڵنیا بووم لەوەی کە سەرۆک لێم ڕازییە و هەردەم دەستی دەخستە سەرشانم و پێدەکەنی.. ئەو تەنها بەبینینی خوێن قەڵس دەبوو!؟

پەیوەندییەکی باشم لەگەڵ ئەو سستەرەدا پەیدا کردبوو، کە لە نێو ساختمانەکەدا کاری دەکرد، بەردەوام پەیوەندی پێوە دەکردم و داوای سەربازی نوێی لێ دەکردم و تا وەکو کاری برینەوەی پەلە زیادەکان بەردەوام بێت.. نەمدەویست نان براو بێت.. بەردەوام سەربازە زامدارەکانم بۆ دەنارد و زۆر جارانیش ساغەکانیشم بۆ ڕەوانە دەکرد، ئەویش جار ناجارێک نامە ڕەشەکانی بەناونیشانی، پیاوێکی خۆڵاوی بۆ دەناردم. (نابێت خوێن بڕژێت).

هەردەم بەپێی ئەو گوتەیە کارم دەکرد، ڕەنگە ڕژانی تەنها یەک دڵۆپە خوێن کۆتایی بەجەنگ بهێنێت، یان جەنگێکی سەیروسەمەرەتر هەڵگیرسێنێت.

بۆ یەکەم جار پۆلێک لە باڵندە خۆڵاوییەکان، ئاسمانی گۆڕەپانەکەیان تەنی و چەکێکی ئاسمانی خۆڵاوییان بەدیار خست و چەشنێک لە نیگەرانییان لا جێ هێشتم.

ئاسایی نەبوو، ئەو باڵندانە بەوێدا بفڕن.. پاش تاوێک لە بێدەنگی هەندێک لە سەربازەکان لە نێو پەڕ و باڵی باڵندەکاندا ڕاکشابوون.

ئەمجارەیان جێی خۆڵباران، پەڕ و باڵی خۆڵاوی دەباری.. سەربازەکان لە فەرمانەکانم یاخی بوون و بۆ یەکەم جار بوو کە هەستم دەکرد، فەرماندە نیم.

سەدەهایان بەبەرچاوی خۆمەوە، بێ شەرمانە ڕادەکشان و چاویان لێک دەنا.

بەڵام ئەوەیان چاک بوو، زامەکانیان خوێنی لێ نەدەچۆڕا.. وام هەست دەکرد، هێشتا کە بەپێوە بم، یان ڕەنگە وەک ئەوان ڕاکشابێتم.. ڕەنگە هەموو شتێک کۆتایی هاتبێت، یان کێ دەزانێ ڕەنگە لێرەشەوە شتەکان دەسپێکیان هەبێت.

تەنها شتێک کە سەرقاڵی کردبووم.. نەدەبوو کەسیان قسەی سەرۆک پشتگوێ بخەن و ڕێگە بەدڵۆپە خوێنێک بدەن لە زامێکەوە دابچۆڕێ!؟

تەنها شتێکی گرنگ: (نەدەبوو خوێن بڕژێت).

هێور هێور ئاسمان شین هەڵدەگەڕا و هەورەکانی خۆڵبارانیش

دەرەوینەوە.

تەنها ڕێگەیەکی ڕەش و بێ کۆتا درێژ دەبۆوە کە لە چەقەکەیدا خوودەیەک ئۆقرەی گرتبوو.. ئەو مێشانەی کە تێی ورووکابوون، سوور هەڵدەگەڕان و پاشان بەردەبوونەوە.. لە دڵۆپە خوێن دەچوون.. پێش ئەوەی چاوم لێک بنێم و وەک هەموو ئەوانەی دیکە بخەوم... دوا نامەم بۆ سەرۆک نووسی:

(گەورەم... سەرۆک؛

ڕەنگە جەنگ لە ئێستادا کۆتایی هاتبێت، یان دەستی پێ کردبێت.. بەدرێژایی ئەو مێژووەی کە ئێمە تێیدا بووین، نەمانهێشت تەنانەت یەک دڵۆپە خوێنیش بڕژێت.. گەر پرسیاری ئەو خوودەیەی چەقی ڕێگا و ئەو دڵۆپە خوێنانە دەکەیت، ئەوە دڵنیات دەکەینەوە کە تەنها کۆمەڵێ مێشی سوورن؛ کە دەیانەوێت پاکی و بێ گەردی جەنگە ڕەواکەمان لەکەدار بکەن و چەواشەکردنی مێژووە...

ئیمزا: پاڵەوان).

نامەکەم هەڵگرت و بەسکەخشکێ بەرەو خوودەکە کشام... دەبوو بەخێرایی بگەمە لای و ڕێ لە بەربوونەوەی دڵۆپە خوێنەکان بگرم، یا با بڵێین مێشە سوورەکان.

نەدەبوو خوێن بڕژێت، بەتایبەتیش خوێنی سەری پاڵەوانێک؟!

هەموو هەوڵەکانم بێهوودە بوو، جەستەم بەبێ ئەو خوودەیە یان ئەو کیسەڵە یان ئەو سەرە، یان هەر شتێکی ناو دەبەیت، نەیدەتوانی ببزوێت.. چنگەکانم لە جێی خۆیان زیاتر ڕۆچوون و پێیەکانیشم بەپەڕی باڵندە خۆلاوییەکان داپۆشران و ملیشم تەنها دوو دەماری

دەبزوا .. بەشەکەی تریشی لە نێو خوودەکەدا بوو.

دارشەقەکەش زۆر دوور کەوتبۆوە...

بەهێمنی و بەبێ ڕژانی تەنها یەک دڵۆپە خوێنیش گەنمە تەڵخەکانی جەنگ چەکەرەیان دەکرد.

گەرچی هێشتا نامەکەم نەگەیشتبووە دەستی سەرۆک، بەڵام نامەیەکی ئەوم لە بەردەم خوودەکەدا بینییەوە و تێدا هاتبوو:

(پاڵەوان...

دەزانم ئەو دڵۆپە خوێنانەی کە لە سەرتەوە دادەچۆڕێت؛ تەنها کۆمەڵە مێشێکی لاسارن).

پاش ئەو وشە بەنرخانەی سەرۆک، ڕۆحم تەواو ئاسوودە بوو، بۆ یەکەم جار هەموو دەمار و بۆڕییە خوێنە گرژەکانی جەستەم ئاوەلا کرد و نەک چەند دڵۆپە خوێنێک، بەڵکو دەریایەک خوێنم دەرخواردی ئەو مێشانە دا کە بەدرێژایی ساڵانی جەنگ نەمتوانی سنووری گیزە گیزیان تێپەڕ بکەم.

# پێڕست